# بێدەنگی زمان و زمانی بێدەنگی

لەو دەروازەیەوە خۆمان ڕووبەڕووی دوو چەمکی سەرەکی دەکەینەوە، ئەوانیش زمان و بێدەنگی، لە نێوان ئەو دوو چەمکە بۆشاییەك هەیە کە خاوەنی وێنەیەکی نادیارە، وێنەیەك نووسین لە بۆشاییەوە دەگۆڕێتە سەر سیستمێکی دەلالی، سیستمێك دواتر بە نووسینەوەی مانا کۆتایی دێت، بۆیە لە نێوان زمان و بێدەنگی مانا خۆی دەنووسێتەوە، نووسینەوەی مانا خاڵیکردنەوەی چەمك و سەرلەنوێ بارگاویکردنەوەیەتی بە دەلالەتی نوێ. دەلالەتێك چەمك لە تاکە مانایی ڕزگار دەکات و بەرەو فرە مانایی دێنێت، بە ماناکردنی هەریەکە لە زمان و بێدەنگی دەلالەت بەخشین و بەرهەمهێنانەوەیەکی نوێیە بۆ خوڵقاندنی جیاوازی، جیاوازی لەو تێڕوانینەی هەمیشە ویستویەتی لە ناو تاکە دەلالەتێکەوە ڕاڤەی بابەتەکان بکات، کورتکردنەوەی دنیا بووە لە نێوان بەهەشت و دۆزەخ، جەللاد و قوربانی، (شێخ زانا) جەللادە و دەسەڵاتی سیاسی کوردی قوربانی، لە دەرەوەی ئەو لۆژیکەوە ئێمە دەبینەوە

بەرهەمهێنەرەوەی جەللاد، ئەو تێگەیشتنە نایەڵێت بێترس ڕووخساری پشت دەمامك بناسین، ناسین بەرەنجامی پرسیارە، بۆیە ئێمە لەو کتێبەدا زۆر مەبەستمانە دەسبەرداری تەواوی وەڵامەکان بین لە ناسینی (شێخ زانا) و دەمانەوێ لە ڕێگەی گومانێکی زۆرەوە پرسیار ئاراستەی ئەو هەموو یەقین و ئومێدە بکەین کە دەسەڵات لە ڕێگەی میدیاکانەوە ئارەزووی چەسپاندنی خۆشباوەڕی لە ناو کۆمەڵگا دروستکرد، دیارە لەو کاتەی گومان لەو یەقینە گەورەیە دەکەین کە یەك ڕووی بابەتەکانی نیشانداین، بەوەی (شێخ زانا) جەللادێکی گوناهبارە، دەسەڵات لە تەك کۆمەڵگا بێگوناهە، گومان دەمانباتە سەر کۆمەلە پرسیارێك کە تا ئەو ساتەوەختە نەمانکردووە، بەڵام ئەو پرسیارانە هەرگیز بەخشینی زانیاری نییە بە خوێنەر، بۆیە ئەو خوێنەرەی بیەوێ لەو کتێبەوە بزانێت ئێمە ئەو کارەکتەرە بە گوناهبار دەزانین یا بێگوناه زوو تووشی ڕەشبینی دەکەین، هەر ئومێدێك کە بەو نووسینەی هەبێت لەگەڵ ئەو دەسپێکە کۆتایی دێت، چونکە هەرگیز بەو مەبەستە کارمان نەکردووە، بەڵکو ڕێك بە پێچەوانەوە ویستومانە ئەو پۆلینکردنەی لە نێوان جەللاد و قوربانی کراوە کە بە پۆلینکردنێکی ناتەواوی دەزانین، بیگۆڕین بۆ ناو فرەمانایی چ لە ئاست کارەکتەرەکە و چ لە ئاست خوێندنەوەی جیاواز.

چونکە ئەوەی دەگات بە ئێمەی وەرگر زانیاریەك نییە بکرێتەوە بەسەر خوێندنەوە، بەڵکو ئەوە دەسەڵاتە زانیارییەکمان پێدەدات، بۆئەوەی بە ویستی خۆی خوێندنەوەیەکی تاکڕەهەند بە بابەتەکە ببەخشێت، ئەوەی لەو بابەتە توانای ئازادبوونی نییە دیکۆمێنتەکان نین، بەڵکو دیکۆمێنتەکان توانای ئەوەیان هەیە وەکو تێکستێك زمان بەو تێکستە ببەخشن، بە واتای لە تێکستێکی بێدەنگەوە بیگۆڕن بۆ تێکستێکی زمانەوانی، ئەو کاتەی بوو بە زمانەوانی بە مانای تێکستێکمان هەیە، ئاماژە زمانەوانییەکانی تەئویل دەکرێت و فرەمانایی وەدەست دێنین، بەڵام کاتێ دەسەڵات لە ڕێگەی دەزگا ئایدیۆلۆژییەکانی لە جۆری پۆلیس و ئاسایش و تەلەڤزیۆن تاکە ڕاڤەیەك بە دیکۆمێنتەکان دەدات، بە مانای زمان دەکوژێت، کوشتنی زمان دەبێتە هۆی لە دایك نەبوونی تەئویل، هەر کاتێك تێکستێکمان نەبوو تەئویل بکرێت، ئەوا لە ناو دۆخی بێدەنگی ئاخاوتن شوێنی زمان دەگرێتەوە، ئاخاوتن بازنەیەك بۆ لۆژیکە عەقڵییەکان دەستنیشان دەکات، هەرچی زمانە تواناکانی دواندن تیایدا دەتەقێتەوە وەك نەست وایە، ئەو جوغزە دەستنیشان کراوە لە زماندا دەتەقێتەوە و لە ناو سیستمێکی ڕێکخەر بێدەنگی دەبێت بە خاوەنی زمانی تایبەت بە خۆی، پڕکردنەوەی بۆشایی نێوان (بێدەنگی زمان) و (زمانی بێدەنگی) کەناڵێکە بۆ دەستکەوتنی تێکستێك کە هەمیشە

توانای خۆنووسینەوەی هەبێت، چونکە بێدەنگی زمان بە تەنیا پرۆسەیەك نییە تیایدا زەمینەی بە دەنگهاتنی زمان بچێتە دۆخێکیترەوە، بەڵکو ئەو پرۆسەیە لە قولایی خۆیدا ملکەچی گوتاری بێدەنگکردن هاتووە لەلایان دەسەڵاتەوە، بێدەنگکردن گەڕانەوەی دیکۆمێنتەکانە بۆ ڕەفەی تۆز لێنیشتوی ئەرشیفی تەلەفزیۆن، شاردنەوە ڕووی ڕاستەقینەی دیکۆمێنتە، چونکە حیکایەتی (شێخ زانا) بۆ دەسەڵات حیکایەتێك نییە مێژووی تاوانی گرووپێکمان بۆ بگێڕێتەوە، بەڵکو حیکایەتێکە دەچێتەوە ناو یەکێك لە حیکایەتەکانیتری حزب، بەوەی گرووپەکەی (شێخ زانا) شکستیان هێنا لە بەرامبەر جەبەڕووتی ئەو دەسەڵاتە.

چ ستراتیژێك لە پشت گێڕانەوەی حیکایەتی (شێخ زانا) وەستابوو؟ ئێمە لە قسەکردنمان دوو جۆر گێڕانەوەمان بۆ حیکایەت و ڕووداو هەیە، یەکەمیان گێڕەرەوە (حیکایەتخوان) شتەکان وەك ئەوەی ڕوویداوە دەیگێڕێتەوە، بۆ قسەکانیشی دیکۆمێنتەکان دەخاتە ڕوو، جۆری دووەمی گێڕانەوە حیکایەتخوان لە ڕێگەی تەفسیرکردنی بۆ حیکایەتی گێڕانەوە قسە دەکات، دیکۆمێنتەکان دەخاتە خزمەتی ڕاڤەکردنەکانیەوە، بە مانای گێڕەرەوەی یەکەم حیکاتخوانێکە زانیارییەکانمان وەك خۆی بۆ دەگێڕێتەوە، بەڵام ئەوەی دووەم وەك چۆن خۆی ئارەزووی دەکات ئاوا بۆمانی دەگێڕێتەوە، لەو نێوەندەدا

دیکۆمێنتەکانیش بە ئاقاری ستراتیژە ئایدیۆلۆژییەکانی خۆیدا دەبات، ئەوەش بە مەبەستی خەڵەتاندمانە، دیارە حیکایەتی (شێخ زانا) سەر بە جۆری دووەمی گێڕانەوە بوو، ئەوە بەو مەبەستە نا کە (شێخ زانا) و هاوڕێکانی تاوانبار نەبوون، نەخێر بەڵکو گێڕەرەوە هێندەی لە ڕێگەی گەمەی وروژاندنی سۆز و لە پشت بە تیرۆرستکردنی ئەوان ویستی بێگوناهی بە خۆی بدات، ئەوان جەللاد و ئەو قوربانی.

ئەو جۆرەی گێڕانەوە بووە هۆی بێدەنگی زمان، بێدەنگی زمان نەیهێشت مانا کەناڵێك بۆ زمانی بێدەنگی دروست بکات، زمانی بێدەنگی زمانی تەواوی سیستمی دەلالی تێکستە، کە دیارە زمانێکە لە ڕێگەی ئامارەکانیەوە توانای بەرهەمهێنانی گوتاری سەربەخۆی هەیە، بەڵام ئەو زمانە بە دوای پەیوەندی کردن بە بێدەنگی زمان، زمانێکی بێدەنگی دیکۆمێنتەکانی بەرهەم دێنێت، زمانێك لە پشت حیکایەتی تاوانە، بونیادەکانی ئەو گوتارە لە ڕێکخەرەوە دەباتەوە سەر سیستمێکی سەر لەنوێ بونیادنانەوە، کە نەبوونی ئەو زمانە بووە هۆی ئەوەی بیر لەوە بکەینەوە گوتاری بێدەنگی زمان لێکبترازێنین و سەر لەنوێ بونیادەکانی لە ڕێگەی سیستمی زمانی بێدەنگی بنووسینەوە، نووسینەوە بەسەر دوو جۆر دابەش کراوە، لە بەشی یەکەمدا گرفتی سەرەکی لەسەر چەمکی لە سێدارەدانە، چونکە ئەو چەمکە لە بڕی کۆتایی هێنان بە جەللاد لە

کۆمەڵگادا، لە ڕاستیدا چەمکێکە توانای خولْقاندنەوەی جەللادی هەیە، تێگەیشتن لە چەمکی زیندووکردنەوەی جەللاد لە تێڕوانینێکی کۆمەڵناسییانەوە لەسەری وەستاوین، ئەوەش بەو مەبەستەیە کە بزانین تاچەند ئەو بڕیارە بڕیارێکی ناعەقلآنییانە بوو، ئاخۆ کۆتایی هێنان بوو بە حیکایەتی تاوانی (شێخ زانا)؟ یاخود لەو ڕێگەیەوە زانیارییەکان لە کۆمەڵگا شاردرانەوە؟ ئەوە سەرەڕای ئەوەی لە سێدارەدان بواری بۆ بە کۆمەلآیەتی بوون نەهێشتەوە، لە بەشەکەیتری ئەو کتێبەش دێینە سەر (شێخ زانا) وەك کارەکتەرێکیتری تەلەڤزیۆنی کوردی، چونکە تەلەڤزیۆن لەم ڕووداوەدا وەك هەمیشە ڕووە تۆقێنەرەکەی خۆی نمایشکرد، ئەوەی (شێخ زانا) ئەنجامی نەدابوو تەلەڤزیۆنی کوردی هێنایە ماڵەکانمانەوە، بۆیە زانا جگە لە کارەکتەرێکیتری تەلەڤزیۆنی کوردی شتێکیتر نەبوو، مەبەستیشمانە بڵێین ئەوەی تەلەڤزیۆن پێی نیشانداین کێ بوو؟ ئەی کە لە سێدارەدرا مانای چی بوو؟ ئایا بە ڕاست هەموو گوناهبار و تاوانکارەکان دەبێت لە سێدارە بدرێن؟

ئەمەی سەرەوە لە بڕی دەسپێکی ئەو کتێبەیە کە لە دوو وتار پێکدێت، وتاری یەکەم "زیندووکردنەوەی بڕیاری لە سێدارەدان.. زیندووکردنەوەی جەلاد" هاوڕێم (زیرەك عەبدوڵلا)

نووسیویەتی، ئەوی دووەمیش " (شێخ زانا) کارەکتەرێکیتری تەلەڤزیۆنی کوردی" نووسینی خۆمە.

**ن . جامی**
25 **فبراپایەری** 2007

## زیندووکردنەوەی بڕیاری لە سێدارەدان..
## زیندووکردنەوەی جەلاد

ماوەیەك بەر لە ئێستا پەرلەمانی کوردستان، بڕیاری سزای لە سێدارەدانی تاوانکارانی زیندووکردەوە، یەکەمین کەسانێکیش کە بەر ئەو بڕیارە کەوتن (گرووپی شێخ زانا)* بوو، واش بڕیارە لە دوای ماوەیەکیتر چەند کەسێکیتر لە گرووپی ئەنسارولئیسلام و هێزە ئیسلامییە توندڕەوەکانیتر و هەندێك تاوانکار لە سێدارە بدرێن.

ئەو وتارە تەرخانە بۆ قسەکردن لەسەر زیندووکردنەوەی ئەو بڕیارە و جێبەجێکردنی لەسەر گرووپی (شێخ زانا).

لە سەرەتاوە دەمەوێ بڵێم ئەگەر ئاراستەیەکی بیرکردنەوە (کە لە ئێستادا بیرکردنەوەی باوی زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵگایە) هەبێت و پێی باش بێت ئەو بڕیارە زیندووکراوەتەوە و لەسەر ئەو گرووپە پڕاکتیزە کراوە، ئەوا من پێچەوانەی ئەو ئاراستەیە بیر دەکەمەوە، بە بڕیارێکی عەقڵانییانە و مرۆییانەی نازانم.

ئەگەرچی لەوەیە هەندێك لە سیاسییەكان و یاساییەكان، ئەوانەی ئەندامی هەردوو حزبی بالادەستی كوردستانن و دەستیان لە زیندووكردنەوەی ئەو بڕیارە هەیە، لۆژیك لەو تێزە یا بیركردنەوەیە نەبیننەوە و پێیانوابێت ئەمە ڕەفتارێكی باشی نییە دژی ئەو بڕیارە قسە بكەین، یاخود ئاراستەی بیركردنەوەمان بەو شێوەیە بێت، بەلام لە ڕاستیدا لۆژیكێكی مرۆڤدۆستی لەو تێز و بیركردنەوەیەدا بوونی هەیە كە من تاسەر ئێسقان باوەڕم پێیەتی**.

بە بۆچوونی من دەتوانین لە چەند ئاستێك قسە لەو بڕیارە و جێبەجێكردنی لەسەر گرووپی (شێخ زانا) بكەین، لە ڕێگای ئەم ئاستانەشەوە بگەینە ئەو حوكمەی كە زیندووكردنەوەی ئەو بڕیارە و پراكتیزەكردنی بەسەر ئەو گرووپە نالۆژیكی و نازانستی و نامرۆیی و ناكۆمەلایەتییە.

*　　*　　*　　*

## ئاستی یەكەم: كوشتنی زانیاری

یەك لەو ئاستانەی كە بە شێوەیەكی جیدی پەیوەستە بەو پرسە، ئەوەیە لە سێدارەدان و كوشتنی ئەو گرووپە، لە سێدارەدان و كوشتنی زانیارەییە، چۆن دەرگایەك بە ڕووی خانوویەكدا دادەخەیت و ئیدی ناوەوەی نابینرێت، ئاواش ئەو

بڕیـارە دەرگـای بەسـەر زانیـاری داخـست، چـیدی نەیهێـشت ئەنـدامانی کۆمـەڵگا زانیـاری زیاتریـان لـە بـارەی ئـەو گرووپـە دەستکەوێت. بەڵام بۆچی دەڵێین کوشتنی ئەم گرووپە کوشتنی زانیارییە؟ چونکە کوشتنی ئەم گرووپە دیلیتکردن و نەهێشتنی دەنگیانە لـە بوون، ئەمـەش لـە ئاستە کردەییەکەیدا نەهێشتنی قسەکردنە، نەهێـشتنی گەیشتنی دەنگـی ئەوانـە بـە گوێـچکەی ئەنــدامانی کۆمــەڵگا لــە کــاتی ویــستنی قــسەپێکردنیان، بــە مانایــەکیتر بێبەشــکردنی ئەنــدامانی کۆمەڵگایــە لــە بیــستنی دەنگـی تاوانکـاران، بـۆ زانـینی زانیـاری ڕاسـت و دروسـت لـە بارەیانەوە، ڕێگانەدانە بە لایەنی مەدەنی و زانستی سەربەخۆ بۆ وەرگرتنی زانیاری ڕاست و دروست لێیانە، تاوەکو ئەوانیش لــە ڕێگــای جیاجیــاوە بــۆ ئەنــدامانی کۆمــەڵگا بیگوازنــەوە. کوشـتنی ئـەم گرووپـە کوشـتنی زانیارییـە، چـونکە مـەیلێك و ئاراستەیەك بۆ نەهێشتنی ئاشکرابوونی نهێنی و زانیاری ورد و دروست لە بارەی ئەو گرووپـەوە لـە ئارادایـە، ئەمـەش بۆخـۆی یەکێکە لە پرسیارە گرنگ و جەوهەرییەکانی ئەو پرسە.

دەبێت دان بەو ڕاستییە دابنرێت کە تاکەکانی کۆمەڵگا ماف خۆیانە زانیـاری لـە بـارەی ئـەو گرووپـە وەربگـرن کـە ماوەیـەکی زۆر ژیانی کۆمەڵگا و ئەندامەکانی بە خۆیـەوە خـەریك کـردووە، تاکەکان ماف خۆیانە لە بارەی ئـەو گرووپـەوە بەوەنـدە زانیارییـە ئیکتیفـا نەکـەن، خــەڵك ئــەو زانیارییانــەی کــە لــە کەناڵــە

ڕاگەیاندنەکان پێی ئاشنا بوو، هەر ئەوەندە لە بارەی ئەو گرووپە دەزانێت، ئەو زانیارەییانەش ئەوانەن کە دەسەڵات و حزبە سیاسییەکان ویستیان بیزانێت، بەڵام خۆ ئەو زانیارییانە تەواوی زانیارییەکان نەبوون لە بارەی ئەو گرووپە و ڕەفتارەکانیان.

زانیاری لە بارەی گرووپی (شێخ زانا) تەنها زانیارییەك نین پەیوەست بێت بە دەسەڵات و حزبە سیاسییەکانەوە، بەڵکو پەیوەستیشە بە کۆی کۆمەڵگا، چونکە قوربانیانی دەستی ئەو گرووپە، تەنها پێك نەهاتوون لە لایەنگرانی دەسەڵات و حزبە سیاسییە باڵادەستەکان، بەڵکو خەڵکی سیڤیلیش قوربانین، بەشێوەیەکیتر لەو پرسەدا دەسەڵات و هاوڵاتی بەیەکەوە بەشدارن، بۆیە خەڵك ماف خۆیەتی زیاتر لە بارەی ئەو گرووپەوە بزانێت، لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئەویش ئایا چۆن زانیاری دەست خەڵك دەکەوێت؟ بێگومان زانیاری بە شێوازی جۆراوجۆر دەگوازرێتەوە و دەست خەڵك دەکەوێت، واتا بۆ گواستنەوەی زانیاری کەناڵ و ئامرازی جۆراوجۆر هەیە، بەڵام گرنگترین ئامرازی گواستنەوەی زانیاری ڕاگەیاندنە، بۆیە ناتوانین قسە لەو پرسە و نەگەیشتنی زانیاری بکەین، بەبێ قسەکردن لە ڕاگەیاندن و ئەو ڕۆڵەی کە ڕاگەیاندن گێڕای.

بە بۆچوونی من ڕاگەیاندن لەو پرسەدا پەیڕەوی لە هەر دوو تیۆرەی "کاریگەری ڕاستەوخۆی کورتخایەن ( Short term effect)" و " دەرگاوان (Gate-keepar-Theory)" کردووە.

بەپێی ئایدیا و پرنسیپی تیۆرەی "کاریگەری ڕاستەوخۆی کورتخایەن (Short term effect)" ڕاگەیاندن بەکاردەهێنرێت بۆ ئەوەی لە ماوەیەکی دیاریکراوی کورتدا، کاریگەری لەسەر بینەر یا وەرگر بکات و ئامانجە خواستراوەکان بپێکێت. بەڵام ئایا ڕاگەیاندن لەوکاتەدا چی بڵاودەکردەوە، لە ڕاستیدا ڕاگەیاندن لە ڕێگای ئەم وێنانەی کە نمایشی دەکرد، ترس و تۆقێنی بڵاودەکردەوە، لەوکاتەدا هەوڵی تەلقیحکردنی خەڵك بە ترس لەلایەن ڕاگەیاندندا ئامادەیەکی بەرهەستی هەبوو، خەڵك لە ماوەیەکدا بە ڕادەیەکی زۆر ترسێنرا و تۆقێنرا، بە شێوەیەك وایلێهاتبوو لە سێبەری خۆی بترسێت، لێرەوە هاوڵاتی مافی خۆیەتی بزانێت ئەو شەبەحەی دواوەی چی بوو؟ ئەو شەبەحە لە کوێ و چۆن و بە چی دروست بوو، کێ گەراکەی داناوە؟ چۆن تروکا و گەشەی کرد و بووە بوونەوەرێك کە ڕەفتاری دوژمنکارانە و نا کۆمەڵایەتییانە بکات و لە دەرەنجامیشدا ترس و تۆقاندن بڵاوبکاتەوە؟. بەمکارەیدا ڕاگەیاندنی دەسەڵات حالەتێکی دەروونی و کۆمەڵایەتی نێگەتیڤی بۆ خەڵك دروستکرد، تووشی شپرزەیی کردن، تووشی بێهیوایی و بێتوانایی کردن، بەمەش دەسەڵات بە هەڵە ڕاگەیاندنی خۆی

بەکارهێنا و سوودی لێوەرگرت، چونکە کارکردنی لەسەر وەرگر (تاکەکانی کۆمەڵگا) لە ڕێگای پیشاندانی ئەو وێنە ترسناکانەی کە دەست و چەقۆ و بێڕەحمی جەلاد نمایش دەکات، کاریگەری دەروونی درێژخایەنی بەسەریدا دەبێت، نەك کاریگەری کورتخایەن، هەروەها مرۆڤ تووشی حاڵەتی دەروونی و کۆمەلایەتی جۆراوجۆر دەکات، کە هەندێکیان ناتەندروست و ناکۆمەلایەتییە، بەدەر لەمەش ئەم ڕەفتارە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی دیاردەی کۆمەلایەتی نیگەتیڤ، هەر بۆیە ڕاگەیاندنی دەسەلات بەو ڕەفتارەی ڕۆڵێکی نێگەتیڤی گێڕا.

یەکێك لە هەڵەکانی دەسەلات لێرەدا ئەوەیە بە ڕەفتارەکەی وادەکات متمانە و باوەڕ لە نێوانە پەیوەندی ئەندامانی کۆمەڵگا کەمبکاتەوە و بیباتە سەر لێواری نەمان، ئەمەش کوشندەترین و خراپترین ڕەوشە کە کۆمەڵگا و ئەندامانی تێبکەوێت، چونکە ئیدی بە کۆمەڵژیانی مرۆڤ لە مەترسیدایە، واتا ژیانی بە کۆمەڵیانە لە مەترسیدایە، لێرەوە دەسەلات بۆ کارتێکردنێکی کاتی ئەم ڕەفتارە دەکات، بۆ ئەوەی لە مەسیێجی تایبەتیدا پەیامی ئەوە بگەیەنێتە هاولاتیان کە "دوژمنی ئەو دوژمنی هەمووانە"، بەلام با گریمانی ئەوە بکەین کە لە ئێستادا دەسەلات پاڵپشتی هاولاتی بە دەستهێنا و ئامانجەکانی پێکا، خۆ ئیدی ئەو بابەتە هێندە سانا و بێدەرەنجام نییە لەسەر هاولاتی، چونکە هەروەکو ئاماژەم بۆ کرد بەمە حاڵەتێکی

دەروونی و کۆمەڵایەتی نێگەتیڤی بۆ دروست دەبێت، هەر بۆیە هەڵەی دەسەڵات لە بەکارهێنانی ڕاگەیاندندا هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە بۆ پێکانی ئامانجی سیاسی ژیانی کۆمەڵایەتی و ژیانی تاکی (فردی) دەشێوێنێت و شپرزەی دەکات، مرۆڤ دەتۆقێنێت.

* * * *

جگە لە تیۆرەی کاریگەری ڕاستەوخۆی کورتخایەن، دەسەڵاتی کوردی لە گەیاندنی زانیاری بە خەڵك لە بارەی پرسی گرووپی (شێخ زانا) پەیڕەوی لە تیۆری دەرگاوان (Gate-keepar-Theory) کردووە، لە بنەمادا بیرۆکەی ئەم تیۆرە لە کاری پاسەوانەوە هاتووە، ئەو بە حوکمی وەزیفە و ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکەی دەتوانێ ڕێگە بە چوونە ژوورەوەی کەسانێك بدات بۆ ناو ئەو دامەزراوەیەی کە پاسەوانی دەکات، دیسان دەتوانێت ڕێگە لە کەسانی دیکە بگرێت و نەهێڵێت بچێتە ژوورەوە، ئەمەش بەپێی کۆمەڵێك تایبەتمەندی و خەسڵەت. دەرگاوان جەخت لە کەسانی گرنگ و ناگرنگ دەکاتەوە، بەوەی یەکەم شایانی چوونە ژوورەوە و دوا نەکەوتنە، بە پێچەوانەی ئەوی دووەم کە شانسی چوونە ژوورەوەی نییە، ئەمەش چونکە نا گرنگە، نەخوازراو و بێزراو، لێرەدا ڕاگەیاندنکار ڕۆڵی پاسەوان دەبینێت، ئەو ڕێگە بە بڵاوبوونەوەی هەندێك زانیاری دەدات کە خۆی بە پێویستی

دەزانێت و پێیوایە گرنگە و دەبێت بڵاوبێتەوە، ڕێگەش لە هەندێك دەگرێت، چونکە پێیوایە گرنگ نییە و ئامانجەکان ناپێکێت و ئەو بەهایە بڵاوناکاتەوە کە دەخوازرێت. ئەم تیۆرە لە ناوەڕۆکیدا بە دوو شێوە مامەڵە لەگەڵ زانیاری دەکات، ئەوانەی بڵاودەکرێنەوە و ئەوانەش کە بڵاوناکرێنەوە، ئەمەش لەسەر بنەمای گرنگی زانیارییەکان، هەر چەندە بیرۆکەکە ئەوەیە کە زانیاری گرنگ بڵاودەکرێتەوە و نا گرنگیش بڵاوناکرێتەوە، بەڵام ئایا ناکرێت مەبەست ئەوە بێت کە زانیاری گرنگیش بڵاونەکرێتەوە، بە تایبەتی ئەوانەی نەخواستراون و زیان بە بەرژەوەندی کەناڵەکە و بەرپرسانی دەگەیەنن؟ من پێموایە ئەو قسەیە ڕاستە کە ڕێگا دەدات هەندێك زانیاری گرنگ بڵاوبکرێتەوە، هەندێك زانیاری گرنگیش بڵاونەکرێتەوە، ئەوەش بەپێی ئایدیا و سیاسەت و خواستی ئەو لایەنەی کە کەناڵی ڕاگەیاندنەکە بەڕێوە دەبات، یان بەپێی گرنگی زانیارییەکان بۆ ئەجندای ڕاگەیاندنەکە و لایەنە پەیوەستدارەکەی. لێرەدا دەسەڵات ئەوەی بە گرنگی دەزانێت بۆ بڵاوکردنەوەی جۆرێك لە بیرکردنەوە و دنیابینی و بەهای کۆمەڵایەتی و سیاسی بڵاوی دەکاتەوە، بە پێچەوانەشەوە ئەوەی بە گرنگی نازانێت و دژە خواستە فەرامۆشی دەکات و بڵاوی ناکاتەوە، چونکە ئەمجۆرەیان لەلای دەسەڵاتەوە زانیاری ترسناکن و نابێت بڵاوبکرێنەوە، زانیاری کوشندەن و

دەرەنجامی مەترسیداریان هەیە، کەواتا لێرەدا دەسەڵات مامەڵەی لەگەڵ زانیارییە گرنگەکانە، ئەوانەی دەبێت بڵاوبکرێنەوە، ئەوانەش کە نابێت بڵاوبکرێنەوە.

لە ڕاستیدا ڕاگەیاندنی دەسەلات و حزبەکان لە پرسی (شێخ زانا)دا چۆن زانیاری گرنگیان بڵاوکردۆتەوە، ئاواش زانیاری گرنگیان شاردۆتەوە کە خەڵك ماف خۆیەتی بیزانێت. بەم ڕەفتارەی ڕاگەیاندن بەشداری لە دروستبوونی ڕەوشێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەخلاقی وا دەکات کە شەفافبوونی دامەزراوەکانی کۆمەڵگا و دەوڵەت تێیدا بوونی نییە، ئەمەش بۆخۆی زەنگێکی مەترسیدارە، چونکە دیکتاتۆریەت و نایەکسانی و نادادپەروەری کۆمەڵایەتی تیایدا ئەگەرێکی مومکین و شانسێکی زۆری دەبێت.

* * * *

ڕاگەیاندن خەسڵەتگەلی جیاجیای هەیە، یەکێك لە خەسڵەتەکانی ئەوەیە بەبێ حیکایەت و سیناریۆ هەڵناکات، لە خەسڵەتێکیتریدا ڕاگەیاندن ئامرازێکی ئاراستەکارە و وەرگر ئاراستە دەکات، لەمەشدا چەکێکی دووسەری کوشندەیە، چۆن دەکرێت سوودگەیەنەر بێت، ئاواش زیانگەیەنەر، بەم دوو خەسڵەتەی، ڕاگەیاندن دەتوانێت ئیش لەسەر بینین و هەست و سۆزی وەرگر بکات، دەتوانێت لە ڕێگای مەسێج و پەیامەکانی ئاراستەی دەروونی و کۆمەڵایەتی و سیاسی ( change-

attitude) بگۆڕێت، دەتوانێت لە ڕێگای مەسێج و پەیامەکانی بیکاتە مرۆڤێکی ڕقهەڵگر، دەشتوانێت بیکاتە مرۆڤێکی لێبووردە و دادپەروەر. ڕاگەیاندن دەتوانێت وابکات مرۆڤ هاوسۆزی تاوانباران بێت، دەتوانێت جەلاد بکاتە قوربانی، پیاوکوژ و گیرفانبڕ بکاتە کەسێکی دادپەروەر، خائین بکاتە شۆڕشگێڕ...هتد، بە مانایەکیتر ڕاگەیاندن کاریگەرترین چەکە بۆ کارتێکردن لە جەماوەر، ئەگەر جۆری کۆمەڵگاکە هەر چییەك بێت، ئەوا ڕاگەیاندن کاری خۆی هەر دەکات، بەڵام جۆر و ئاستی کارتێکردن لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکیتر دەگۆڕێت، ئەمەش بەپێی ئاستی ڕۆشنبیری و مەعریفەی باوی ئەندامانی کۆمەڵگا، تاوەکو تاکەکانی کۆمەڵگا ئاستی مەعریفییان لاواز بێت، بەو ئەندازەیە کاریگەری ڕاگەیاندن لەسەریان بەهێز دەبێت، چونکە ئەو واقیعە لە ئارادایە کە تێیدا مرۆڤەکان گومان و پرسیاری جیدی لە بارەی ڕەهەندە ناچۆنیەکەکانی پرسەکان و حیکایەتەکانی ڕاگەیاندن ناکەن، بە پێچەوانەشەوە ڕاستە.

لەبەرئەوەی لە بونیادی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردیدا، مەعریفەیەکی هەمەکی و ئاینی باڵادەستە بەسەر ڕەوشی بیرکردنەوەی زۆرینەی ئەندامانی کۆمەڵگا، ئەمەش لە خۆیدا مەعریفەیەکی ئاست لاوازە، بۆیە ڕاگەیاندن کاریگەری گەورەی هەیە، بەڵام ڕاگەیاندن لە دەست کێیە؟ بێگومان لە دەست دەسەڵات و پارتە سیاسییەکانە، بۆیە ڕاگەیاندن و

سـیناریۆکانی کاریگـەرترین چـەکن بـە دەسـت دەسـەڵات بـۆ گەیاندنی پەیامی خۆی بە جەماوەر و گێڕانەوەی حکایەتەکانی بـە جـۆرێکی دیـاریکراو، تـاوەکو ئاراسـتەیەکی دەروونـی و کۆمەڵایەتی و سیاسی تایبەت لەلایان دروست بکات.

دەسەڵاتی کوردی بەو زانیارییانەی کە لە ڕاگەیاندنەکاندا بڵاوی کردەوە، وێنەیەکی زیهنی لە مێشکی ئەندامانی کۆمـەڵگا ڕرواند، بێگومان ئەوَ وێنە زیهنیە لەسەر تەواوی زانیارییەکان لە بارەی ئـەو بابەتـەی وێنـاکراوە بونیـاد نـەنراوە، بۆیـە بەمـە واقیعێکـی ناتـەواو و سـاختە لـە جێـی واقیعێکـی تـەواو و ڕاستەقینە پەخش دەبێت، دەشێت ئەو واقیعەی لای خەڵك هەیە بەشێکی واقیع بێت، ئەو ڕاستییەی لای خـەڵك هەیە بەشێکی ڕاستییەکان بێت، نەك هەمووی، هەر بۆیـەش تیۆری دەرگاوانی بـەکارهێناوە، تـاوەکو بـەردەوام بەشـێکی ڕاسـتیمان پێئاشـنا بکـات و بەشـێکی ڕاستیـشمان لێبـشارێتەوە، ئـەم تیـۆرە زۆر تەبایـە لەگـەڵ گەمـە سیاسـییەکانی سیاسـەتمەدار و پارتـە سیاسییەکانی وڵاتانی ڕۆژهەڵات (وڵاتانی ڕۆژئاواش لێی خاڵی نین)، هەر بۆیە لەم وڵاتانەدا زۆر بایەخدارە و کاری پێدەکرێت، چونکە باشترین ئامرازە بەهۆیـەوە بەشێك لـە زانیارییـەکان لـە خـەڵك بـشارێتەوە، مـرۆڤ بـە زانیاریـەکان نـامۆ بکـات، لـە هەمانکاتیشدا پەیامی خواستراوی بگەیەنێتە خەڵك.

*    *    *    *

وتمان سیناریۆکانی ڕاگەیاندن ئەندێشەی مرۆڤی سادە و مەعریفە لاواز دەهەژێنێت، بەمەش ئەگەری پێکانی ئامانجەکان ئاسانتر و مومکینتر دەبێت، بەڵام ئەمە لە سەرێکدا پەیوەستە بە توانا و لێزانی ڕاگەیاندنکارەکان لە دارشتنی سیناریۆ و گێڕانەوەی حیکایەتەکان، تاوەکو توانا و شارەزایی ڕاگەیاندنکار لە دارشتنی سیناریۆ و گێڕانەوەی حیکایەتەکان زیاتر بێت، ئەوا ئەوەندە ئاستی کارتێکردن لە وەرگرێکی مەعریفە لاواز زیاتر دەبێت، بەڵام ئێمە لە ئەتمۆسفێرێکداین کە ڕاگەیاندنکاران بە هۆی ڕووداوە جیاوازەکانی کۆمەڵگا (شەڕی خۆکوژی بە نموونە) ئەوەندە لێزانن لە داڕشتنی سیناریۆ و گێڕانەوەی حیکایەت، ئیدی زۆر بە ئاسانی دەتوانن کاریگەری لە (وەرگر) بکەن، لێرەوە من واتێگەدەم مێژووی نوێی ڕاگەیاندنی کوردی، مێژووی داڕشتنی سیناریۆیە بۆ کردە و ڕەفتارە سیاسییەکان، گێڕانەوەی حیکایەتەکانە بە شێوەیەك کە تارادەیەك هەژارە لە ڕاستی، لەمبارەیەوە سەدان ڕەفتاری تاوانکاری پەی پێدەبرێت کە بە شێوەیەك سیناریۆی بۆ دارێژراوە، بە هۆیەوە ئەندامانی کۆمەڵگا سۆزداری بۆ تاوانکار دەربڕن و بێتاوان بەرنەفرەتدەن، جاش و خائین بە شۆڕشگێڕ و شۆڕشگێڕیش بە جاش و خائین ببین، قوربانی بە جەلاد و جەلاد بە قوربانی ببینن. واتا ڕاگەیاندن وێنەکان و ڕاستییەکان سەراوژوور دەکات، دەیانشێوێنێت، بە شێوەیەك وێنەیەك و

ڕاستییەکی ناڕاستەقینە بە وێنەیەك و ڕاستییەکی ڕاستەقینە پیشاندەدات. ناتوانین باسی پرسی (شێخ زانا) بکەین، بێئەوەی باسی ڕۆڵی ڕاگەیاندن بکەین، ئەوان ئەو ئەتمۆسفێرەیان خۆشکرد کە سیاسەتمەداران و یاساناسان بیر لە زیندووکردنەوەی بڕیاری سزادانی توندی لە شێوەی لە سێدارەدان بکەنەوە، ئەوان ئەو ئەتمۆسفێرەیان خۆشکرد کە ئەو یاسایە سەر لە نوێ زیندوو بکرێتەوە، لە بەرامبەریشدا ئەندامانی کۆمەڵگا و کەسانی ڕۆشنبیر و سیاسییەکان و چالاکڤانان و دامەزراوەکانی بواری کۆمەڵگای مەدەنی و مافی مرۆڤ...هتد، پرۆتستۆی ئەو کردەیە نەکەن و بێدەنگی لە بەرامبەر پرسەکە هەڵبژێرن، واتا قسە نەکەن زیندووکردنەوەی ئەو بڕیارە قبووڵ بکەن، بەمەش لە شوێنێکدا مەترسی ڕاگەیاندن دەردەکەوێت. لێرەوەیە ڕاگەیاندن چەکێکی دوو سەرەیە، هەر تەنها سوودی بۆ کۆمەڵگا نییە، بەڵکو لە شوێنی ناچۆنیەکدا زیانیشی هەیە، بە بۆچوونی من لێرەدا ڕاگەیاندن دوو خەتا دەکات، جارێك زانیاری تەواو بە وەرگر نادات و دەیشارێتەوە، جارێکیش بوار بۆ زیندووکردنەوەی بڕیاری مەترسیداری لە شێوەی لە سێدارەدان خۆش دەکات، بە هۆی ئەوەی بوارێکی بێدەنگی گشتی دەڕەخسێنێت، کە یارمەتیدەرە بۆ زیندووکردنەوە و جێبەجێکردنی بڕیارەکە.

* * * *

لەم پرسەدا ڕاگەیاندن پەیڕەوی لە تیۆرەی دەرگاوان کردووە، بەپێی ئەمە جۆرێك لە زانیاری بڵاودەکاتەوە و جۆرێکیتریش بڵاوناکاتەوە، بەڵام بڵاوکردنەوەی زانیاری چەندە مەترسیدارە، بڵاو نەکردنەوەشی ئەوەندە، ئەو زانیاریانەی بڵاودەکرێنەوە چەند گرنگن، ئەوانەی بڵاویش ناکرێنەوە ئەوەندە گرنگن، بەڵام بۆچی گرنگن؟ لەبەرئەوەی هەموو زانیارییەك ڕێخۆشکارە بۆ تێگەیشتنی لایەنێکی پرسەکە، ئەگەر ئەوانەی شاردراونەتەوە بڵاوکرابانەوە، ئەوا خەڵك باشتر لە ڕەهەندەکان و نهێنییەکان و کاراکتەرەکانی پرسەکە دەگەیشتن، باشتر لە هۆکار و لایەنە پەیوەستدارەکانی پرسەکە دەگەیشتن، باشتر لە ڕاستییەکانی پرسەکە دەگەیشتن، ئەو زانیارییانەی بڵاونەکراونەتەوە ئەگەر بڵاو بکرێنەوە وێنەیەکی ڕوونتر و ئاشکراتر بە هاوڵاتی دەبەخشن، بۆیە خەڵك مافی خۆیەتی تەواوی زانیارییەکان بزانێت، بزانێت ئایا ئەو گرووپە تەنها گرووپێکی تاوانی ڕێکخراوە، یاخود گرووپێکی سیاسییە و بۆ مەبەستی سیاسی کاریان کردووە؟ بزانێت ئەندامانی ئەو گرووپە پەیوەندیان لەگەڵ کام سیاسی ئەو وڵاتەدا هەبووە؟ جۆری پەیوەندی نێوانیان چی بووە؟ ئەندامانی ئەو گرووپە بۆ چەند لەو سیاسییانە کاریان کردووە؟ ئاخر ئێستا ئەگەر شتێکی لەو شێوەیە هەبێت چۆن دەزانین و پەی پێدەبەین؟ چۆن زانیاری لەبارەیەوە وەردەگرین؟ دیارە لەو زەمەنیشدا کەم

نەبوون ئەندامانی پارتە سیاسییە جیاجیاکان، کە لێرە و لەوێ قسەیان لەسەر هەبوونی پەیوەندی بەرپرسی پارتەکان لەگەڵ ئەم گرووپە دەکرد، کەم نەبوون ئەو دانیشتنانەی کە ئەندامان و لایەنگرانی پارتەکان بە تـوانج ئاماژەیان بۆ بوونی پەیوەندی ئەو گرووپە بە پارتەکان دەکرد، بۆیە خەڵك ماف خۆیەتی ڕاستی ئەو پرسانە بزانێت.

کوشتن و لە سێدارەدانی ئەو گرووپە، کوشتن و لە سێدارەدانی زانیارییە کە خەڵك ماف خۆیەتی بیزانێت، داخۆ ئەو گرووپە چۆن دروست بوو؟ کێ لە پشتی بوو؟ کێ یارمەتیداون؟ لە کاتی شەڕی خۆکوژیدا چیان کردووە؟ چۆن گەشەیان کردووە؟ چۆن گەیشتوونەتە ئەو ئاستە بێئەوەی یەکێتی و پارتی و دەزگا ئیستخباراتەکانیان پەی پێببەن؟ لەو وڵاتەدا بچوکترین گرووپ دامەزرێت کە بیانەوێت سەنتەرێك دابنێن، یاخود ڕۆژنامەیەك دەرکەن، بە کەمترین کات ئەو دەزگا جاسوسییانە پێی دەزانن، هەر زوو پەیوەندیان پێوە دەکەن، تا بۆشیان بکرێت گەرای خۆیان لە هەناوی دروست دەکەن، باشە مانای چییە لەو واقیعەدا گرووپێکی لەمجۆرە مەترسیدار هەبێت و ئەو دوو دەزگایەش ئاگایان لێنەبێت، لۆژیکی نییە وا بیربکەینەوە کە پاراستن و زانیاری ئاگاداری گرووپی (شێخ زانا) نەبووبن؟ ئەی دەزگاکانی حکومەتی هەرێم، ئەوانەی بەرپرسن لە ئاسایشی هاوڵاتیان لە کوێی ئەو ڕووداوەدان؟

خەڵك ماف خۆیەتی بزانێت ڕۆڵی ئەو دەزگا بەرپرسانە لەو پرسەدا چییە؟ ئاخر کارەساتە لە ماوەی چەند ساڵێکدا گرووپێکی تاوانکاری ڕێکخراوی لەو جەشنە هەبێت و دەزگا ئەمنییەکانی حکومەت پێی نەزانن. خەڵك ماف خۆیەتی بیزانێت کە هاوڵاتییەك لە پڕێك ون دەبێت و چیدی دیار نامێنێت ئەو دەزگایانە چ ڕێوشوێنێکیان گرتۆتە بەر؟ باشە ئەو دەزگایانە چۆن خەڵك دڵنیا دەکەنەوە لەوەی ژیانیان سەلامەتە و هەڕەشەی مەرگیان لەسەر نییە؟ چۆن هاوڵاتی دڵنیا دەکەنەوە لەوەی گرووپێتری لەمشێوەیە نییە؟ خەڵك ماف خۆیەتی پرسیار لە کون و قوژبن و هەموو ڕەهەندە پەیوەستەکانی ئەو پرسە بکات و وڵامیشی دەست کەوێت، بەڵام کاتێك وەڵامی دەست ناکەوێت، کاتێك دەبینێت بە پەلە تاوانکاران دەکەونە بەر پراکتیزەکردنی بڕیاری لە سێدارەدان، ئەوا دەبێت گومان لەوە بکات کە مەبەستدارانە ئەو بڕیارە زیندووکراوەتەوە، هەر بۆیە من پێموایە مەبەستدارانە لە ئێستادا ئەو بڕیارە زیندووکراوەتەوە.

لەسەرێکدا دەبێت گومانی ئەوە بکەین کە زیندووکردنەوەی ئەو بڕیارە و جێبەجێکردنی لەسەر ئەو گرووپە، مانای وایە دەشێت ئەوانەی دەستیان لە پشت زیندووکردنەوەی ئەو بڕیارە هەیە، بە شێوەیەك لە شێوەکان جۆرێك لە نێوانە پەیوەندیان لەگەڵ ئەندامانی ئەو گرووپە

هەبێت، لە هەمانکاتیشدا نەیانەوێت ئاشکرا بێت، بەڵکوم هەر بە نهێنی بمێنێتەوە و خەڵك نەیزانێت، ئەگەرنا بۆچی دەبێت ئەو بڕیارە لەو کاتەدا زیندوو بکرێتەوە و بە خێراترین کاتیش لەسەر ئەندامانی ئەو گرووپە پراکتیزە بکرێت؟

ئەم بڕیارە لەسەر ئەم گرووپە پراکتیزە دەکرێت، لەبەرئەوەی وەك خۆیان جەختی لەسەر دەکەن تاوانکاران، مرۆڤکوژن، دەستیان لە کوشتنی مرۆڤ هەیە، شێوێنەری ڕەوشی ژیانی کۆمەڵگان، زیانی ماددی و ڕۆحی و مەعنەوییان بە ئەندامانی کۆمەڵگا گەیاندووە، بەڵام لێرەوە پرسێك دێتە پێشەوە ئەویش ئایا ئەو بڕیارە لەسەر هەموو تاوانکارێکی لەم چەشنە و لەسەر هەموو مرۆڤکوژێك پراکتیزە دەکرێت، یان تەنها بۆ نەیارانی ئەو دوو پارتە سیاسییە باڵادەستەیە، تەنها بۆ لایەنگرانی پارتە سیاسییە ئیسلامییە توندڕەوەکان و تاوانبارە بێپشتەکانە؟ ئەوانەی کوڕی سەرۆك خێلێك یا خزمی بەرپرسێك نین، ئەوانەی لە نێو دیوەخانێکدا گەورە نەبوون و ئێستاش ژمارەیەك چەکداری بە دواوە نییە، ئەگەرنا باشە چەندین کەس هەیە، لە سەرووبەری شەڕی یەکترکوژیدا لە نێوان ئەو دوو حزبە باڵادەستەی ئێستا ئەو بڕیارەیان زیندووکردۆتەوە، شایانی ئەوەن لە سێدارە بدرێن؟ ئەوانەی بە کۆمەڵ خەڵکیان دەکوشت، ئەوانەی خەڵکی سیڤیلیان لە گوند و کۆمەڵگاکان تۆپباران دەکرد، ئەوانەی لە دەزگا ڕێکخستنە

تایبەکانی هەردوولا، خەڵك و هەوادار و لایەنگرانی یەکتریان دەرفاند و لە ئاقار و دەرەوەی شارەکان دەیانکوشتن، ئەوانەی گرووپی گوللەبارانکردنی نهێنی شەری خۆکوژی بوون و لە چیاکان و گردۆلکە و دۆڵ و پەنادارەکان چەکداریان دەکوشت، ئەوانەی نەخشەی بەسەردادان و کوشتن و تەقینەوەیان دادەنا، ئەوانەی زۆر لێزانانە بە سەدان شێوە هەوڵیاندەدا خەڵك قوڕ بەسەر وماڵوێران بکەن و سەری گرێدەن، ئایا ئەمانە ڕەفتاریان هاوشێوە و خراپتریشی گرووپی (شێخ زانا) نەبووە؟ ئەی بۆچی قسەیەك لەسەر ئەوانە ناکرێت؟ بۆچی هیچ یاسایەك بە یاسای لە سێدارەدانیشەوە ئەمانە ناگرێتەوە؟ خۆ ئەمانەش تاوانێکی ڕێکخراو بوو، لە هەمانکاتیشدا بۆ دەسەڵات گرتنەدەست بوو وەکو گرووپی ناوبراوی لە سێدارەدراو. ئەی ئەوانەی سیخوری ڕژێمی تۆتالیتێری بەعس بوون و ئێستاش پێگەی ئیداری و سیاسی بالایان هەیە و دەستیان لە بە کوشتدانی تاکی کوردی هەیە، ئەوانەی بە پێش سوپای ڕژێمی بەعس دەکەوتن و لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان تاکی کوردیان دەکوشت، یا ڕاپێچی مەرگی بە کۆمەڵ و ئەنفالیان دەکرد، بۆ قسە لەسەر ئەوانە ناکەن، خۆ ئەمانەش تاوانێکی ڕێکخراو بوو، بە زانایانە دەکرا.

لێرەدا دەشێت گومانەکەمان قووڵ بکەینەوە لەوەی ئەو بڕیارە مەبەستدارانە لە ئێستا زیندووکراوەتەوە و بەسەر ئەو

گرووپە تاوانکارە پڕاکتیزە کراوە، ئەم ڕەفتارەش بە پلەی یەکەم ئامانج لێیەوە شاردنەوەی زانیاری بێت لە هاولاتیان، ئاشکرا نەبوونی زانیاری بێت بۆ هاولاتیان، چونکە بە دڵنیاییەوە لە ئاشکرابوونی زانیارییەکان، ئیدی ماسکەکان دەدرێن و ڕاستییەکان وەك خۆیان دەردەکەون، کە دەشێت ڕاستییەکی ناخۆش و بێزراو بێت لەلایەن دەسەلات و پارتە بالادەستەکانەوە، لێرەشدا دەسەلات شەڕی لەگەڵ ئەو گرووپە تاوانکارە نییە، بەڵکو شەڕی لەگەڵ زانیارییە، شەڕی لەگەڵ بە نهێنی هێشتنەوەی زانیارییە، شەڕی لەگەڵ ئەوەیە زانیاری تەواو نەگاتە هاولاتی، هەر بۆیە هەموو ئەو ڕێوشوێنانە دەگرێتەبەر کە دەبێتە کۆسپ و تەگەرە لە پێش گەیشتنی زانیاری دروست بە هاولاتی، هەر لە سیناریۆ و حیکایەتی ناو ڕاگەیاندنە تایبەتەکانیەوە، هەر لە داخستنی دەرگا بە ڕووی ڕۆژنامەنووسان و ڕاگەیاندنی ئازادەوە، هەر لە داخستنی دەرگا بە ڕووی لایەنی سەربەخۆ و ئەکادیمی وەك زانکۆ، تاوەکو بە پەلە لە سێدارەدانی ئەو گرووپە. زیندووکردنەوەی بڕیاری لە سێدارەدان و پڕاکیتزەکردنی لەسەر ئەو گرووپە (بەو خێراییە) گەورەترین پرسیارە لە بارەی ئەو پرسەوە، لە هەمانکاتیشدا گەورەترین هەڵەیە.

بە کورتییەکەی لەم ئاستەدا دەڵێین هەڵەیەکی گەورەکراوە لە کوشتن و لە سێدارەدانی ئەو گرووپە، هەر چەندە ئەو هەڵەیە

مەبەستدارانەیە، چونکە هەوڵدراوە بە هۆیەوە زانیاری لە خەڵك بشاردرێتەوە، پێموایە باشتر وا بوو ئەو گرووپە لە سێدارە نەدرێن، تاوەکو هاوڵاتی زانیاری زیاتری لە بارەیەوە دەستکەوێت.

*　　*　　*　　*

## ئاستی دووەم: تاوان و ڕەفتارکردن لەگەڵ تاوانکار

گرووپی (شێخ زانا) گرووپێکی تاوانکاربوون، لە سێدارەدانیش سزای تاوانەکانیان بوو، بۆیە ئێمە لە ئاستی دووەمدا قسە لەسەر تاوان و چۆنیەتی ڕەفتارکردن لەگەڵ تاوانکار دەکەین، ئایا تاوان بە چەمکە سۆسیۆلۆژییەکەی چی دەگەیەنێت؟ ڕەگوڕیشەی تاوانکردن بۆ کەی دەگەڕێتەوە؟ ئایا دەتوانرێت کۆمەڵگایەکی میسالی هەبێت کە تاوانی تێدا نەبێت؟ بۆ کەمکردنەوەی تاوانکردن کۆمەڵگاکان چیان کردووە؟ ئایا لەگەڵ تێپەڕبوونی زەمەندا چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ تاوانکار کراوە؟ ئایا لە سێدارەدان سزایەکی عەقڵانییە یاخود پێچەوانەکەیەتی؟...هتد. ئەمانە ڕستێك پرسیاری گرنگن کاتێك باسی تاوان و سزا دەکەین، دەبێت بەسەریان بکەینەوە.

تاوان (Crime) بە چەمکە سۆسیۆلۆژییەکەی بریتییە لە هەر کردارێك کە مرۆڤ دژی یاسا و ڕێسا باوەکانی کۆمەڵگا دەیکات، بە شێوەیەکیتر بریتییە لەو کردار و ڕەفتارانەی کەوا

لەلایەن مرۆڤەوە ئەنجام دەدرێت، دژی بنەماکانی ئاکاری ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای مرۆین، لە پشت ڕوودانیان زیان بە کەسێك، لایەنێك، یان کۆی کۆمەڵگا دەگەیەنرێت. دەشێت واپێناسی تاوان بکەین کە بریتییە لەو ڕەفتارەی کە دەستدرێژی دەکاتە سەر سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئەو بەهایەی کە بەڕێوەی دەبات، هەروەها (ڕادکلیف براون)ی کۆمەڵناس پێناسی تاوانی کردووە بەو ڕەفتارەی کە عاداتی کۆمەڵگا پێشێل دەکات.

چەمکی تاوان لە شوێنکاتێکەوە بۆ شوێنکاتێکیتر، لە دوو کاتی جیاوازی ناو یەك شوێنیش جیاوازی هەیە، بۆ هەر یەکێك لە مانەوە ستایلێکی جیاوازی بیرکردنەوە لە بەرامبەر دیاردەی تاوان هەیە، دیاردە هەیە لە شوێنکاتێکدا بە تاوان ناوزەد دەکرێت، هەر بۆیە سزاشی بۆ دادەنرێت، بەڵام ڕەنگە هەمان دیاردە لە شوێنکاتێکیتردا بە شێوەیەکی ئاسایی سەیر بکرێت و بە تاوان دانەنرێت، بەمشێوەیە سزاشی نابێت.

*　　*　　*　　*

تاوان وەکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی ڕەگوڕیشەیەکی قووڵی هەیە، بەپێی ڕیوایەتە ئایینیەکان لەگەڵ بوونی مرۆڤدا تاوان بوونی هەیە، دروستبوونی ژیانی مرۆیی لەسەر زەویدا لە بنەمادا هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ تاوانکردن. کاتێك ئادەم و حەوا وەکو دوو بوونەوەری مرۆیی لە بووی حەرامکراو نزیك

دەبنــەوە، ئــەوا تاوانیــان کــردووە، بەمــەش ســزا دەدرێــن، لــە دەرەنجامـدا ژیـانی مرۆڤایـەتی لەسـەر زەوی دەسـت پێـدەکات. ئەگـەر بگەڕێینـەوە بـۆ مێـژووی نووسـراو و سەرچـاوەکانیتر کـە باسی ژیـانی مرۆڤ و ڕووداوەکـان دەکـەن، ئەوا نموونـە گەلێکی یەکجار زۆر دەدۆزینەوە لە بارەی ئـەوەی مرۆڤ تـاوانی کـردووە، مـرۆڤ هـەر تـەنها تـاوانی لـە بەرامبـەر بوونـەوەری هاوچەشـنی (مرۆڤ) نەکردووە، بەڵکو لە بەرامبـەر کۆی بوونـەوەرەکانی بـوون و خــودی سروشــتیش کــردووە، هــەمووانی لــە پێنــاو خــۆی بــەکارهێناوە و ئیــستغلال کــردووە، (ئەمــە باســێکی تــرە لــە شـوێنکاتێکیتر قـسەی لەسـەر دەکـەین)، لێرەوەیـە کـە تـاوان و مــرۆڤ بــە یەکــەوە لکێنــراون، مــرۆڤ بــەبێ تــاوانکردن هــەڵی نەکردووە، ژیانی مرۆڤایەتی لەگەڵ خۆیـدا بـوارێکی فراوانـی بـۆ تاوانکردن هەڵگرتووە.

* * * *

تــاوان وەکــو دیاردەیــەکی کۆمەڵایــەتی هــەڵگری ســیما و خەسڵەتی تایبەتە، یەکێك لەو خەسڵەتانە ئەوەیە کە پەیوەستە بە دوو جەمسەر، یەکێکی تاوانکار و یەکێکی تاوان لەسەرکراو، یــەکێکی دەســتدرێژکار، یــەکێکی دەســتدرێژ لەســەرکراو، لــە پڕۆســەی تاوانکردنــدا کەســی تاوانکــار ســودمەند و لێــدەرە، کەسـی تـاوان لەسـەرکراو زەرەرمەنـد و لێـدراوە، ئەمـە تـا ئـەو شـوێنەی تاوانکـار دەسـتگیر نـەکرا بێـت، بـەڵام کاتێـك دەسـتگیر

دەکرێت، ئیدی پڕۆسەکە بە جۆرێکیتر دەگۆڕێت، حوکمی یاسا و سیستەمی دادپەروەری دێتە گۆڕێ، حیسابات و لێکۆڵینەوە دێتەگۆڕێ، لێرەوە ئیدی تاوانکار زەرەرمەند دەبێت، تاوان لەسەرکراویش هەوڵی گەڕانەوەی مافەکانی بۆ دەدرێت.

خەسڵەتێکیتر ئەوەیە لە ئەزموونەوە دەرکەوتووە کە تاوان لەگەڵ خۆیدا زیان دەهێنێت، هیچ تاوانێك بەبێ زیانگەیاندن بوونی نییە، هەر بۆیە دەتوانین بڵێین پەیوەندی تاوان و زیانگەیاندن، پەیوەندیەکی حەتمییە، لە دەرەنجامی تاواندا هەر دەبێت زیان ئامادە بێت، زیانی تاوانیش جۆراوجۆرە، ئەمەش پەیوەستە بە ئاستەکانی دەستدریژیکردن، زیان هەیە ماددیە، هەشە مەعنەوی و گیانی. ئەگەر دەستدرێژییەکە بۆ سەر کەلوپەل و ئامێری ماتریالی بێت، ئەوا زیانەکە ماددی دەبێت، بەلام ئەگەر دەستدرێژییەکە بۆ سەر خودی مرۆڤ بێت، ئەوا زیانی مەعنەوی و گیانییە، ئەمەش ئاستە مەترسیدارەکەی تاوانە.

زیانی تاوان هەر تەنها لەسەر کەسی تاوان لەسەرکراو نییە، بەڵکو ئاستی تریشی هەیە، دەچێتە سەر کۆمەڵگا و دەوڵەت، لەبەرئەوەی دیاردەی تاوان دیاردەیەکی زیانگەیەنەرە، بۆیە کۆمەڵگاکان و دەوڵەتەکان بیریان لەوە کردۆتەوە پێش لە تاوانکردن بگرن و بە گوێرەی توانا کەمی بکەنەوە، بۆ ئەم مەبەستە بە ستایلی جیاجیا هەوڵیانداوە، بەلام مێژووی ژیانی

مرۆڤایەتی ئەوەی سەلماندووە، کە ئەبەد نەتوانراوە ئەم خواستە بەرجەستە ببێت، چونکە بەردەوام و لە هەموو کۆمەڵگایەکدا تاوانی جۆراوجۆر هەیە، بە ستایلی جۆراوجۆریش پەیڕەوی لێدەکرێت، کەواتا "ناتوانرایێت کۆمەڵگایەکی میسالی هەبێت کە تاوانکردنی تێدا نەبێت"، ئەمەش پێچەوانەی خواستەکانی کۆمەڵگا و دەوڵەتەکانە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕەنگە تاڕادەیەك خواستەکان لە نەهێشتن و کەمکردنەوەی جۆری جیاجیای تاوان (بە تایبەتی لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان) دەستەبەر کرابێت، چونکە هەروەکو ئەوەی زانایان جەختی لێدەکەن، تاوەکو ئاستی ڕۆشنبیری کۆمەڵگا و تاکەکانی بەرز بێت، ئەوا تاوانکردن کەم دەبێت، بەڵام ئەمە مانای وانییە تاوان بوونی نەبێت تیایاندا، بە پێچەوانەوە تاوان لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان بە ستایلی زۆر لێزانانە و بە پلاندانان دەکرێت، هەروەها گرووپی تاوانی ڕێکخراویشیان بە ڕێژەیەك تێدایە، ئەمە جگە لە تاوانەکانی دەوڵەت و بەرپرسەکانی کە لە ژمارە نایەن، بۆ نموونە تاوانەکانی گەندەڵی، تاوانی بە هەدەر بردنی سەروەت و سامانی کۆمەڵگاکان، تاوانەکانی قڕکردنی نەژادی و ڕەگەزی، تاوانەکانی بە کۆمەڵ کوشتنی مرۆڤ لەسەر دەستی دەوڵەتە مۆدێرنەکانی وەکو ئەمریکا و فەرەنسا و بەریتانیا و ئەڵمانیا. ..هتد، لەمبارەیەوە مێژووی مرۆڤایەتی سەدان ڕووداوی تێدایە

کە دەتوانرێت بە نموونە بهێندرێتەوە، لەوانە بە کۆمەڵ کوشتنی جولەکەکان لەسەر دەستی ئەڵمانەکان و بە کۆمەڵ کوشتنی ئەرمەنەکان لەسەر دەستی تورکەکان و بە کۆمەڵ کوشتنی ڤێتنامییەکان و یابانییەکان و ئەفغانییەکان لەلایەن ئەمریکییەکان و بە کۆمەڵ کوشتنی لوبنانییەکان و فەلەستینییەکان لەلایەن ئیسرائیلیەکان، بە کۆمەڵ کوشتنی کورد لەلایەن عەرەبە شۆڤینییە بەعسییەکان، جگە لەمە بە هەدەربردن و تالانکردنی وڵاتانی ئەفریقیا لەلایەن فەرەنسا و بەریتانیا وئیتاڵیا و وڵاتە ئیمبریال و داگیرکارەکانیتر، ئەمانە هەمووی تاوانی گەورەن و لە مێژووی مرۆڤایەتیدا تۆمارکراون، ئەگەر لەمبارەیەوە تاوانەکان بژمێرین، ئەوا دەبێت سەدان لاپەرە نووسین تەرخان بکەین.

* * * *

بۆ ئەگەری ڕێگرتن و کەمکردنەوەی تاوان، کۆمەڵگا هەوڵیداوە ئەندامانی کۆنترۆڵ بکات، بۆ ئەمەش مەنزومەیەکی قیەمی داناوە کە بە هۆیەوە بەها و مانا بە کردەوەکان دەدات، ئەم مەنزومەیە کۆمەڵێك بکە و مەکە، حەلاڵ و حەرام، واتا یاسا و ڕێسایەکی کۆمەڵایەتی دیار کردووە، بە هۆیەوە هەوڵدەدات تاکەکان ئاراستە و کۆنترۆڵ بکات.

ئەم مەنزومەیە هەوڵدەدات ئەو ڕەفتارانە بێبەها و بێزراو بکات کە ناکۆمەڵایەتین و زیان بە ئەوانیتری ناو کۆمەڵگا

دەگەیەنێت، بە پێچەوانەوە ئەو ڕەفتارانە بە بەها و نرخ دەكات كە كۆمەڵایەتین و تاكەكەس لە پشتییەوە زەرەرمەند نابن.

جگە لەمە كۆمەڵگا سیستەمێكی یاسایی و دادوەری داناوە، بە شێوەیەك لەسەر هەموو كەسێك پڕاكتیزە بكرێت، لە هەمانكاتیشدا ماف هەمووان بپارێزرێت، واتا سیستەمێكی یاسایی بۆ كۆنترۆڵكردنی تاكەكان و نەهێشتنی لادانیان، هەر كەسێكیش لە سیستەمی یاسایی دانراو لابدات، لە ڕێگەی دامەزراوەكانی تایبەت بەم بوارە سزا دەدرێت، كەواتە سزدان ئەو ڕێوشوێنەیە كە لە بەرامبەر تاوانكار دەگیرێتەبەر، بۆ مەبەستی كۆنترۆڵكردن و نەهێشتنی لادان. سزاكانیش جۆراو جۆر دەبن، لەوانە (**سزای جەستەیی و فیزیكی**) وەكو لێدان و لە سێدارەدان و كوشتن و سەربڕین، (**سزای كۆمەڵایەتی**) وەكو بێبەشكردن لە هەندێك ماف و ئیمتیازات، (**سزای زەوتكردنی ئازادی**) وەكو دەستگیركردن و دوورخستنەوەی لە كۆمەڵگا، (**سزای دارایی**) وەكو پێبژاردن و قەرەبۆكردنەوەی پارە...هتد، ئەوەشمان لە بیر نەچێت هەموو سزادانێك ڕەهەندێكی دەروونی لەخۆ دەگرێت.

فەلسەفەی سزادان ئێمارەی جیاجیای لەخۆ گرتووە كە هەندێكی ڕاستەوخۆ و هەندێكیش ناڕاستەوخۆن، ڕاستەوخۆكە بۆ تێگەیاندنی تاوانكارە بەوەی كردەوەی خراپەكاری و تاوانكاری سزادانی بە دواوەیە، تۆش لەبەر كردەوە

تاوانکارییەکەت دەبێت سزا وەربگریت، جگە لەمە پێیدەڵێت دەبێت خۆت چاك و بە کۆمەڵایەتی بکەیتەوە، جارێکیتریش بیر لە تاوانکاری و خراپەکاری نەکەیتەوە، کەواتە لە دیوە ڕاستەوخۆکەیدا فەلسەفەی سزادان تەمبێکردن و بە کۆمەڵایەتیکردنی تاوانکارە.

لە دیوە ناڕاستەوخۆکەیدا فەلسەفەی سزادان هەڵگری مەسێجێکە بۆ کۆی تاکەکانی نێو کۆمەڵگا، کە تیایدا ئاگاداریان دەکاتەوە لەوەی ڕەفتاری تاوانکاری سزادانی هەیە، ئەمەش بە سروشتی خۆی ڕێگریکردنە لەبەردەم ئەگەری لادانی تاکەکان، کەواتە هەوڵدانە بۆ ئەگەری کەمکردنەوەی ڕەفتاری ناکۆمەڵایەتییانە و نا یاساییانەی تاك لە نێو کۆمەڵگادا، لێرەوە فەلسەفەی سزادان بۆ کۆمەڵگا بێسوود نییە، بەڵام لەبەرئەوەی سزادان جۆری جیاوازی هەیە، بۆیە ئاستی سوودگەیاندنیشی ناچۆنیەکە.

* * * *

سزادانی تاوانکار واتا وەڵامدانەوەی تاوانکار بە ڕەفتار، واتا ڕەفتارکردن لەگەڵیدا، لەبەرئەوەی لە نێو ژیانی کۆمەڵایەتیدا جۆری جیاوازی سزادان هەیە، کەواتە ڕەفتاری ناچۆنیەکیش لەگەڵ تاوانکار هەیە، ئەمەش پەیوەستە بە سروشت و تایپی بونیادی کۆمەڵایەتی و سیستەمە پەیوەستەکانی، پەیوەستە بە ئاستی گەشەسەندنی کۆمەڵگا و

جیهانبینی و مەعریفەی باوی ئەندامەکان، لە مێژووی ژیانی مرۆڤایەتیدا پرۆسەی سزادانی تاوانکار لەگەڵ گۆڕانی سروشت و تایپی بونیادی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاکان، لەگەڵ گەشەسەندنی کۆمەڵگا و بیرکردنەوە و دنیابینی و مەعریفەی باوی مرۆڤەکان، گۆڕانکاری بەسەر داهاتووە، هەروەکو هەندێك سەچاوەی زانستی لەو بوارە ئاماژەی پێدەکەن گرنگترین چەرخە هەمەجۆرەکانی پەرەسەندنی سزا بریتین لە (سەردەمی تۆڵەسەندنەوە- سەردەمی بەزەیی و مرۆڤایەتی- سەردەمی زانستی نوێ)، لە هەر یەکێك لەم چەرخانە شێوازێکی تایبەتی سزا لە بەرامبەر تاوانکار پەیڕەو کراوە.

لە (سەردەمی تۆڵەسەندنەوە)دا سزای تاوانبار تۆڵەسەندنەوە بوو لێیەوە، تۆڵەسەندنەوەیەکی ڕاستەوخۆ، ئەمەش لەلایەن جەمسەری تاوانلێکراو بە ئەنجام دەگەیشت. ئەم سەردەمە بە دوو قۆناغدا تێپەڕیووە، قۆناغی تۆڵەسەندنەوەی تاکی (فەردی)، قۆناغی تۆڵەسەندنەوەی گشتی، لە قۆناغی تۆڵەسەندنەوەی تاکی، تاوانلێکراو ڕاستەوخۆ تۆڵەی لە تاوانکار دەکردەوە، لەمەشدا دوو ڕێگە هەبوو، ئەوانیش یان هەمان ئەو ڕەفتارەی لە بەرانبەر دەکردەوە کە کردوویەتی، یانیش لەلایەنی داراییەوە پارەی پێدەبژێرێت.

لەم قۆناغەدا لەبەرئەوەی بەرژەوەندییەکانی زیاتر تاکی بوون، مەبەست تاك بەرگری لە مافەکانی خۆی دەکرد، بۆیە

تۆڵەسەندنەوەش تاکی بووە، بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدانی بیرۆکەی بەرژەوەندی گشتی، ئیدی کۆمەڵگا لە بڕی تاك بەرگری لە مافی تاوانلێکراو دەکرد و تۆڵەی دەسەندەوە، ئەمەش چونکە تاوانکردن زیانەکەی تەنها لەسەر جەمسەری تاوانلێکراو نەبوو، بەڵکو بۆ کۆی کۆمەڵگا بوو، بۆیە تۆڵەسەندنەوەی تاکی بۆ تۆڵەسەندنەوەی گشتی گۆڕا، ئیدی بە مەبەستی سزادانی تاوانبار سزا لە دەزگای کۆمەڵایەتی دەردەچوو. لەم قۆناغەدا سزاکانی تاوانبار زۆر توندوتیژ بوو، زیاتر جەستەیی بوو لە شێوەی لێدان و لە سێدارەدان، بەڵام لەبەرئەوەی ئەمجۆرە سزایانە، نەبووە هۆی کەمکردنەوەی تاوانکردن، بەڵکو بە پێچەوانەوە زیاتری کرد، چونکە کەسە نزیکەکانی کەسی لە سێدارەدراو، پەرچەکرداری دوژمنکارانەی دەبوو، ئەوەش وایدەکرد تاوان زیاتر بێت، بۆیە بیرکردنەوە بۆ چاککردنەوەی تاوانبار سەریهەڵدا.

لە (سەردەمی بەزەیی و مرۆڤایەتی)دا نۆبەرەی بیرکردنەوەی چاککردنی کۆمەڵایەتی تاوانبار سەریهەڵدا، ئەم بیرکردنەوەیە لە سەرەتادا زیاتر بیرکردنەوەیەکی فەلسەفی و فکری بوو، لەلایەن فەیلەسوفانەوە مەترح کراو قسەی لەسەر کرا، لەوانەش هەر دوو فەیلەسوفی فەرەنسی (ڤۆڵتێر – مۆنتیسکیۆ)، هەروەها (بیکاریێ)ی ئیتاڵی و (هیوم – سمس)ی بەریتانی. ئەم فەیلەسوف و زانایانە پێیانوایە مەبەست لە

سزادانی تاوانبار ئەشکەنجەدان نییە، بەڵکو ڕێگرتنە بۆ نەهێشتنی دووبارە کردنەوەی تاوان، یا نەهێشتنی تاوانکردنی خەڵکانیترە. ئەم فەیلەسوفانە پێیانوایە هیچ سوودێك لە سزای توندوتیژ ناکەوێتەوە، هەروەها لە سێدارەدان و کوشتنیش هیچ بە هیچ ناکات، بۆیە پێویستە بیر لە ڕێگای چارەسەرکردن بکرێتەوە.

بەڵام لە (سەردەمی زانستی نوێ)دا و لە دوای شکست خواردنی سزای قورس و توندوتیژ، ڕوو کرایە چاککردن و هەڵسەنگاندن، بە تایبەتی لە دوای سەرهەڵدانی ڕێبازی واقیعی کە پێیوایە کارە تاوانییەکان بەرەنجامی بارودۆخی کۆمەڵایەتی دەوروبەر و بارودۆخی کەسی تاوانبارەکەیە، بۆیە پێویستە بارودۆخەکانی (کۆمەڵگا و تاك) لەبەرچاو بگیرێت و چاککردن هەبێت و تاوانبار بگێڕدرێتەوە ناو کۆمەڵگا. لەم سێ سەردەمەی کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێکرد، دەکرێت بڵێین ئەو گەشەسەندنەی مێژوو بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ تاوانکار بەخۆیەوە بینیویەتی، کورت دەکرێتەوە سەر گۆڕینی شێوازی توندوتیژی و تۆڵەسەندنەوە لە تاوانکار و دوورخستنەوەی لە کۆمەڵگا، بۆ شێوازی چاککردنەوەی تاوانبار و گێڕانەوەی بۆ ناو کۆمەڵگا.

* * * *

لە زەمەنە سەرەتاییەکاندا بیرۆکەی چاککردنەوەی تاوانبار بوونی نەبووە، بەڵکو بیرۆکەی سزادان و تۆڵە هەبوو، بەوەی

چـۆن کۆمـەڵ بـە تونـدی سـەیری تاوانکـار بکـات و تۆڵـەی لێبکاتەوە، چونکە ئەو بیرۆکەیە باو بووە کە دەڵێت "تاوانکار چاك نابێتەوە"، هەروەکو ئەوەی کەسێك شێرپەنجەی هەبێت و چاك نەبێتەوە، بۆیە دەبێت بکوژرێت و لە سێدارە بدرێت، لە بوونـــدا ڕەش بکرێتـــەوە، بـــە مانایـــەکیتر ئـــەو بوونـــەوەرە هاوچەشنی شوێنێکی جەستەیە کە تووشی شێرپەنجە بووە، دەبێت ببڕدرێت و لە جەستەی گشتی بکرێتەوە و فڕێ بدرێت، بەڵام دواتر ئەم ئایدیایە لە توندوتیژی و تۆڵەسەندنەوە بۆ چـاککردن گـۆڕا، سـەرەتای ئـەم گۆڕانکارییـەش بـە هـۆی سەرهەڵدانی بزوتنەوەی کیوکێرس "Quakers" لە هەرێمی پەنسلڤانیای وڵاتی ئەمریکا لە ساڵی 1782 بوو، کە داوای دەکرد بەندیخانە بکرێتە شوێنی کار، دواتر لە نیوەی یەکەمی سەدەی (19) کەنیسە بانگەشەی لادانی سزای کرد و داوای کرد پەیڕەوی لە چاککردنەوەی بەندکراو بکرێت، هەر لەم سەرووبەرەشدا ئەم بیرۆکەیە چووە نێو بورای ئەدەب و فیکر و ڕۆشنبیرییەوە، بە تایبەتی لەلایەن ڕۆماننووسی فەرەنسی (ڤیکتۆر هۆگۆ) بە ڕاشکاوانە بینرا، ئەو لە ساڵی 1828 ڕۆمانێکی لەسەر ئەم دیاردەیە بە ناوی (دوا ڕۆژی مەحکومێك) نووسی، تیایدا بە ئاشکرا دژایەتی حوکمی لە سێدارەدانی تاوانکاری دەکرد و داوای دەکرد ئەو سزایە نەمێنێت. دوای ساڵی 1870 بیرۆکەی چاکسازی زیاتر بڵاوبۆوە، چونکە لەو

ساڵەدا (چارلس لۆکاس) (تیۆرەی گرتن)ی دانا، ئەم تیۆرەیە لەسەر بنەمای "مرۆڤ بۆچی تاوان دەکات" بوو. لە ساڵی 1876 لە نیۆیۆرك کۆنگرەی سنستانی بەسترا، لەم کۆنگرەیەدا کۆمەڵێك بنەما و پرنسیپ داندرا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ تاوانکاران، دوای ئەمە (فیلیپۆ گراماتیکا)ی پرۆفیسۆر (تیۆری گراماتیکا – بزووتنەوەی داکۆکی کۆمەڵایەتی)ی دانا، میتۆدی ئەم بزوتنەوەیە بریتییە لە "هەڵوەشاندنەوەی یاسای سزاکان و دانانی یاسای داکۆکیکردنی کۆمەڵایەتی لە جێگەی"، فیلیپۆ ئەم تیۆرەی لە ساڵی 1947 لە کتێبی (بنەماکانی داکۆکیکردنی کۆمەڵایەتی) بڵاوکردۆتەوە، یەکێك لە تێزەکانی فیلیپۆ ئەوەیە "لە جیاتی سزا سەر لە نوێ ڕاهاتنەوەی تاکەکەسی دژ بە کۆمەڵگا"، ئەمەش بە گرتنەبەری ڕێوشوێنی کۆمەڵایەتی پێویست، بە پشتبەستن بە توێژینەوەی زانستی ئەزموونگەری بەربلاو و گشتگیر، هەموو ئەمانە پەیوەستن بەو بزاڤە چاکسازییەی کەوا لەم سەردەمە سەریهەڵداو خۆیان بەسەر واقیعی ژیانی کۆمەڵایەتی سەپاند.

هەر چەندە لە سەرەتادا ئایدیای چاککردنی تاوانبار گفتوگۆی زۆری لەسەر هەبوو، بەڵام لەبەرئەوەی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە وڵاتاندا لایەنگرانی ئەم بیرۆکەیە ڕووی لە زیادبوون دەکرد، بۆیە چاککردن بوو بە ئەرکێکی سەرەکی بەندینخانەکان، لە دەرەنجامی ئەمەشدا چەند دامەزراوێکی

چاکـــسازی دەرکـــەوتن، لەوانـــە ئـــەلمێرای، ئێرلەنـــدی، بورستاڵی...هتد.

* * * *

لـە سـێدارەن جـۆرێکی سـزادانی مرۆڤـە، ئامـانج لێیـەوە کوشتن و لەناودانی ئەو مرۆڤەیە کە لەبەر هـەر هۆیـەك و بـە هـەر پێوەرێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە شوێنێکاتێکی دیاریکراودا بە تاوانکار لە قەڵەم دەدرێت. لە ئاستی کردەییدا میکانیزمی لە سـێدارەدان بریتییـە لـە سـێ داری بەیەکبەسـتراو لـە شـێوەی چوارچـێوەی دەرگـای ژوورێـك، پـەتێك لـە ناوەڕاسـتی داری سـەرەوە شـۆڕبۆتەوە خـوارەوە، لـە شـوێنێك دادەنرێـت کـە ژێرەکـەی پانتاییـەك لـە بۆشـایی تێدا بێـت بـۆ پراکتیزەکردنـی کردەکە، ئەو پەتە ملی تاوانکاری پێدەبەسترێت و پێیدەوترێت (گرێی لە سێدارەدان)، دوای ئەوەی تاوانکار دەبردرێتە شوێنی مەبەست، ئەو پەتـەی دەخرێت مل، چاوی دەبەسترێت، ئینجا فرێدەدرێتـە خـوارەوە (پانتاییـە بۆشـاییەکە)، بۆماوەیـەکی دیاریکراو تاوانکار گیان لە دەست دەدات.

لـە سـێدارەدان یەکێکـە لـە کـۆنترین سـزا کـە لـە بەرامبـەر تاوانکار پەیڕەو دەکرێت، هەر چەندە لە پێش ئەمـەدا لـە زۆرێـك کۆمەڵگاکانـدا (بـە تایبـەتی لـە کۆمـەڵگا ئـایینی و تۆتـالیتێر و دیکتاتۆرەکاندا) سزادانی ملپەڕاندن و جیاکردنەوەی کەللەسـەر لە جەستەی تاوانکار بوونی هەبووە، بەپێی هەندێك سەرچاوە

لە سەردەمی نوێدا یەکەم پرۆسەی لە سێدارەدان لە ساڵی 1076 لە بەریتانیا سەردەمی (شاولیەم) بە تۆمەتی خیانەتکاریی گەورە لە دژی کەسێك بە ناوی (ولیلسیوف) پراکتیزەکراوە. دواتر ئەم جۆرە سزادانە زیاتر پەرەی سەندووە و زۆر لە کۆمەڵگاکان پەیرەویان لێکردووە.

لە سێدارەدان توندترین جۆری سزادانە، چونکە مافی ژیان لە تاوانکار دەسەنێتەوە، ئەمەش دەمانخاتە بەردەم پرسیارێکی ئەخلاقی، ئەویش ئایا مرۆڤ بۆی هەیە مافی ژیان لە مرۆڤ بسەنێتەوە؟

ئەم جۆری رەفتارکردنە لەگەڵ تاوانکار پەیوەستە بە ئاستی پێشکەوتنی کۆمەڵگا و بونیادی کۆمەڵایەتی و سیستەمە کۆمەڵایەتی و سیاسی و یاساییەکەی، ئەمجۆرە سزادانە تاوەکو ئەمڕۆ لە هەندێك کۆمەڵگادا پەیڕەو دەکرێت، بەڵام لە هەندێکیش (بە تایبەتی ئەورووپییەکان) پەیڕەو ناکرێت، سەپاندنی سزای لە سێدارەدان ناکۆکی خستۆتە نێوان پسپۆڕانی ئەم بوارە، لەمبارەیەوە دوو بۆچوونی پێچەوانە هەیە، یەکێك لەگەڵ و ئەویتر لە دژیەتی، ئەوانەی لەگەڵ سەپاندنیدان پێیانوایە کاریگەرترین سزایە بۆ نەهێشتنی مەترسی لەسەر سیستەمی کۆمەڵایەتی و تاکە رێگایەکە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تاوانی ترسناك و تاوانکاری پڕ مەترسی کە چاککردن هیچ سوودێکی لێناکەوێتەوە لەگەڵیاندا. ئەوانەی لە

دژیــدان بــە ســزایەکی نــاڕەوای دادەنــێن، چــونکە هــەموو دەروازەیەك لەبەردەم چاککردنی تاوانکار دادەخات، ئەمەش دژ بە ئامانجەکانی سزای تاوانە لە سیستەمی کۆمەڵایەتیدا و هیچ سوودێك بە تاك ناگەیەنێت. هەر بۆیە ئەوان پرسیارێکی جیدی دەکەن، ئەویش ئایا سزای لە سێدارەدان توانیوویەتی ڕەفتاری تاوانکاری بنبڕ بکات؟ توانیوویەتی کۆمەڵگایەکی دوور لە تاوان بخولقێنێت؟ ئەم جۆری سزادانە هەر تەنها ئەوە نییە کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ تاوانکار دەکوژێت، بەڵکو لەگەڵ ئەودا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کۆمەڵێك کەسی چواردەوری دەکوژێت، بـۆ نموونــە لەلایــەنی ئابوورییــەوە، ئەگــەر تاوانکــار ژیــانی خێزانێکی لەسەر بێت، ئەوا بێگومان ئەو خێزانە شپرزە دەبێت و هەڵدەوەشــێتەوە، لــە دەرەنجــامی ئــەوەدا دەیــان دیــاردەی نێگــەتیڤ و کێــشەی کۆمەڵایــەتی دروســت دەبێــت. هــەروەها لەلایــەنی مەعنــەوی و ناوبــانگی کۆمەڵایەتییــەوە کەســانی چواردەور و نزیکی تاوانکار تووشی ناوزڕانێکی زۆر دەبن، بە تایبەتی لـە کۆمـەڵگا دواکـەوتوو و مەعریفە لاوازەکـان، ئـەوەش کێشەی دەروونـی و کۆمەڵایـەتی جیاجیایـان بـۆ دەخولقێنێـت، لەوانەیـە جگـە لەمـە چـەندین دەرەنجـامی خـراپتری هـەبێت کـە دەشـێت لـە مانـەوەی تاوانکـار و هەوڵـدان بـۆ چـاککردنەوەی هیچیان ڕوونەدەن. لێرەوە ئەگەر تاوانکار قوربانی ڕاستەوخۆی ســزاکە بێــت، ئــەوا کەســانی نزیکــی تاوانکــار قوربــانی

ناڕاستەوخۆن، بە تایبەتی ئەگەر ئاستی هۆشیاری کۆمەڵگاکە نزم بێت. (ئەم قسەیە بۆ پرسی شێخ زاناش ڕاستە)

* * * *

ئاستێکیتری ئەو پرسە (گرووپی شێخ زانا و لە سێدارەدان) ئەوەیە ئەگەر لە کایەی سیاسی و یاساییدا بڕوا بە لە سێدارەدانی مرۆڤ هەیە، ئەوا لە کۆمەڵناسیدا بڕوا بە چاکسازی هەیە، واتا ئەگەر لە کایەی سیاسیدا سزای تاوانبار لە سێدارەدان و کوشتن و لەناودانی، سزایەکی مومکین و ڕەوا بێت، ئەوا لە کۆمەڵناسیدا ئەوە کوفرێکی گەورەیە، لە کۆمەڵناسیدا مرۆڤ هەرچەند تاوانکاریش بێت، دەبێت ئیش لەسەر چاککردنەوەی بکرێت، دووبارە ئامادە بکرێتەوە و بگەڕێندرێتەوە ناو کۆمەڵگا، واتا بە کۆمەڵایەتی بکرێتەوە، هەر بۆیە دەزگا سزادەریەکانی کایەی سیاسی، لە کایەی کۆمەڵناسیدا بۆ دەزگای چاکسازی گۆڕاوە.

ئایا نەدەکرا ئەندامانی گرووپی (شێخ زانا) قەدەرێکیتریان هەبووایە جیاواز لە سێدارەدان؟ پێموایە ئەندامانی ئەو گرووپە دەکرا لە سێدارە نەدرێن، قەدەری لەناودان و مەرگیان پێنەبەخشرێت، بەڵکو چاك و بە کۆمەڵایەتی بکرێنەوە، دەزانم هەناسەی هەندێك کەس بەو قسەیە سوار دەبێت و پێیوایە چاکبوونەوەی ئەو کەسانە ئەستەمە، بەڵام ئەو بیرکردنەوەیە

ناڕاستە، چونکە بە لایەنی کەم بواری ئەوە نەدراوە هەوڵبدرێت بۆ چاککردنەویان، ئەزموونی ئەوەش نەکراوە، چونکە تۆ کاتێك دەتوانیت ئەو حوکمە بدەیت ئەگەر بواری چاککردنەوەت ڕەخساند بێت و ئەزموونت کردبێت و دەرەنجامەکەشت دەست کەوتبێت، بۆیە ئەوەی پێیوایە ناکرێت ئەوانە چاك ببنەوە، دەبێت پێمان بڵێت بۆچی ناکرێت؟ دەبێت بڵێت بەپێی کامە پێوەر و لە دەرەنجامی کامە توێژینەوە گەیشتە ئەو باوەڕ و بیرکردنەوەیە؟

واتێدەگەم چۆن دەکرێت مرۆڤێك لە ڕێگای پرۆسەی مەعریفی جۆراوجۆر و پرۆسەی مێشك شووشتنەوە، وا لێبکرێت ڕەفتاری دوژمنکارانە و ناکۆمەڵایەتییانە لە کۆمەڵگادا بنوێنێت، چۆن دەکرێت جۆرێك لە ڕەفتار و بەهای ناهیومانی و ناکۆمەڵایەتی لەلایەن مرۆڤێکدا بە بەها بکرێت و هەڕمێنی بۆ پەیدا بکرێت، ئاواش پێچەوانەکەی ڕاستە، واتا دەشێت ئیش لەسەر چاکبوونەوەی ئەو گرووپە مرۆڤە بکرێت.

ئەندامانی ئەو گرووپە بوونەوەرێکی بەدەر لە مرۆڤ نین، ئەمانە ئەگەری چاکبوونەوەیان موستەحیل نییە، دەشکرا ئیش لەسەر چاککردنەوەیان بکرێت، بەڵام بە بەرنامەی زانستی و بە توێژینەوەکردنی بەردەوامی ئەو کەسانە، دەبوایە ئەو کەسانە توێژینەوەیان لەسەر بکرێت، دەبوایە بکرابانە بابەتی توێژینەوە لەسەرکردن، تاوەکو لە ڕێگایەوە کۆی ئەو پرسانە بزانرێت کە

بەشــداره لـــە دروســـتبوونیان، نـــەك دووربخرێنـــەوە لـــە توێژینەوەکردنی توێژەرانی بواری کۆمەڵناسی و دەروونناسی، نەك بە هیچ شێوەیەك بوار نەدرێت ڕاگەیاندنکاری بێلایەن و توێژەری کۆمەلایەتی و دەروونی کاری زانستی خۆیان لەسەر ئەم گرووپە بکەن.

* * * *

دەبێت ئەو ڕاستییە بزانین گرووپی زانا دروستکراو و هەڵهێنجراوی واقیعی کۆمەلایەتی ئەو کۆمەڵگایەن، لە ناو ئەتمۆسفێری ئەو کۆمەڵگایە ژیاون، ئەو بونیاد و بارودۆخە کۆمەلایەتییە دروستیکردوون، بە خەلات لە هیچ هەسارەیەکەوە بۆمان نەهاتووە، با کۆمەڵگای کوردی لێبێبەری نەکەین، چونکە واقیعی ژیان لە کۆمەڵگای کوردی واقیعێکی توندوتیژە و مرۆڤی توندوتیژیش بەرهەم دەهێنێت، مومکینە کەسانی لەوە خراپتریشی دروستکردووە، بەلام لەبەرئەوەی بە شێوەیەك لە شێوەکان پیاوی حزبە شەڕکارەکان و دەزگا جاسوسییەکانیەتی، قسەیان لەگەڵ نەکردووە و بەو شێوەیەش فەزحیان نەکردووە و حوکمیان نەداوە. ئەگەرنا با بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای شەڕی خۆکوژی، بزانێن چەندین گرووپی لەمجۆرە سەر بە پارتی و یەکێتی هەبوون، ئەمانە بە ئاشکرا و بە عەنتەری لە پێش چاوی خەڵك تاوانی ڕێکخراویان دەکرد، دەستدرێژیان دەکردە سەر ماڵ و حورمەت و کەسایەتی خەڵك،

ئەم گرووپانەش ئاشکران و زۆربەی خەڵکی ئەو شارە دەزانن کێن (بێئەوەی ئاماژە بۆ ناوی کەسیان بکەین)، با ئەوەش لە بیر نەکەین زۆربەی ئەو سەرکردە سیاسییانە و ئەو بەرپرسە گەورانەی کە ئەمڕۆ لە کایەی سیاسی کوردیدا دیارن، ڕۆڵ دەگێڕن و پێگەی سیاسی و ئیداری بەرزیان هەیە، باسی دادپەروەری کۆمەڵایەتی و چاکە و پیاوەتی و بەهای مرۆڤایەتی دەکەن، ئەوا تاوانکاری بردوویانەتە ئەو شوێنە، مێژووی ئەو بەرپرسانە مێژووی تاوانکارییە، ئەی ئەو بەرپرسانە بە چی بەناوبانگبوون؟ کامەیە ئیشە باشەکانیان؟ هەندێکیان بەوەی دەستی دەچووە کەلوپەل و مومتەلەکاتی خەڵکی کۆمەڵگاکەی و ئاودیوی وڵاتانی دەکرد، هەندێك دەستی بەسەر گومرگەکان دەگرت، هەندێك جەلادەکانیان لە سەحرا و ئاقارەکان خەڵکیان دەکوشت، هەندێك دەچوونە سەر ماڵە پارەدارەکان و سەرانەیان لێدەسەندن، ئەوە جگە لەوانەی لە گۆڕەپانەکان و لە کوشتارگەکاندا سەدان ڕۆڵە و گەنجی ئەو وڵاتەیان دەکوشت، هەندێك....هتد، باشە ئەی ئەمانە چین، ناوی چیان لێبنێین؟ مێژووی کەم سەرکردەی کورد هەیە کوشتن و تاوانکاری تێدا نەبێت، لێرەدا پرسیارێکی گرنگ سەرهەڵدەدات، ئەویش بۆچی ئاساییە بەرپرس و سەرکردەگەلێك لە زەمەنێکدا تاوانکار بوونب و دواتر بتوانن کەسێکی ئیداری و پۆزەتیڤ بن لە ناو کۆمەڵگا، ئەی بۆچی بۆ تاوانکارەکانی گرووپی زانا ناڕاستە و ئەستەمە

بە کۆمەڵایەتی و چاك ببنەوە؟ پێموایە دەکرا قەدەری ئەو گرووپە تاوانکارە قەدەرێکیتر بووایە، نەك کوشتن و لە سێدارەدان.

بەشێکی زۆر لەسەرکردە و بەرپرسەکانی کۆمەڵگای ئێمە لەسەردەمی جیاجیادا خیانەتیان کردووە، زۆرێك لەوانە بە هۆی کردە خیانەتکارییەکەی دەستی هەبووە لە کوشتنی مرۆڤگەلێك لەو وڵاتە، زۆرێك لەوان دەستی هەبووە لە قوڕبەسەرکردن و ماڵکاولکردنی ژمارەیەکی زۆری خەڵك، هەر لە دەیەی (60)کانی سەردەی ڕابردوو تاوەکو شەڕی خۆکوژی کۆتایی سەدەکە، تا ئەو سەردەمەی ئێستا سەدان نموونەی خیانەتکاری بەرپرس و سەرکردەکان دەبینین، هەر لە کوشتنەوە بیگرە تاوەکو دزی و گەندەڵی، باشە خێرە دەکرێت ئەمانە لە خیانەت پاك ببنەوە و ببن بە شۆڕشگێڕ، لە دزی و گەندەڵی چاك ببنەوە و ببن بە کەسێکی ئیداری ئەکتیڤ و دەستپاك، ئەی بۆچی بۆ گرووپی زانا ناڕاستە و ئەستەمە بە کۆمەڵایەتی و چاك ببنەوە؟ ئەمە گەورەترین دووفاقیەتە لە پێوەر، لە قیەم، لە ڕەفتار و هەڵسوکەوت.

* * * *

بڕیای لە سێدارەدانی ئەو گرووپە بڕیارێکی سیاسییانەی ئەبستراکتەرە، ئەو بڕیارە هێندەی سیاسییە، هێندەی مەهامی سیاسییانەی لە پشتەوەیە، ئەوەندە دادوەری نییە، ئەوەندە

مــەهامی دادوەریانــەی لــە پــشتەوە نییــە، ئەمــەش هەڵەیــەکی گەورەیە، چونکە نابێت بڕیاری دامەزراوە دادوەرییەکان لە ژێر کاریگەری دەسەڵاتداران و سیاسەتکاران دابێت، چونکە لەمەدا سیاسەتکاران بە گوێرەی دنیابینی و خواست و بەرژەوەندی سیاسییانەی خۆیان، بڕیاری دادوەرانە بەسەر نەیارانیان دەردەکەن و بەرگی دادوەریانەی لەبەر دەکەن، واتا دامەزراوە و بڕیاری دادوەری لەلایەن سیاسەتکاران و دەسەڵاتداران بۆ مەبەستی سیاسی خواستراو بەکاردەهێنرێت. ئەمەش سیستەمی دادوەری دەخاتە بەردەم پرسیار بەوەی ئایا سیستەمێکی تەندروستە؟ ئایا لە ئاستی چاوەڕوانی هاوڵاتیدا؟ ئایا ئامرازێکە بە دەست دەسەڵات و مەهامی تایبەتی پێ جێبەجێ دەکرێت، یاخود سیستەمێکە بۆ دادپەروەریکردن لە نێوان هاوڵاتیان و هێنانە ئارای دادپەروەری کۆمەڵایەتی و سیاسی لە کۆمەڵگا؟

ئەمە لەلایەك و لەلایەکیتردا بڕیاری لە سێدارەدانی ئەو گرووپە، سەندنەوەی چانسی چاکبوونەوەیە لێیان، سەندنەوەی بوارە لە مرۆڤگەلێك کە دەشێت بە کۆمەڵایەتی بکرێنەوە، لە هەمانکاتدا سەندنەوەی چانسی ئیشکردنی توێژەری کۆمەڵایەتییە، ڕێگانەدانە بە توێژەری کۆمەڵایەتی بۆ بینینی ڕۆڵی کارکردی خۆی، ئەمەش مانای مۆنۆپۆلکردنی کایەی سیاسی و دامەزراوەکانیەتی، بەسەر کایەی کۆمەڵایەتی و

دامەزراوەکانی، کەواتە ئێمە لەبەردەم ژیانێکداین کە سیستەمی سیاسی بە ویستی خۆی دنیاکەی بەڕێوە دەبات، ڕێگا نادات هیچ سیستەمێکیتر ڕۆڵی کاریگەری هەبێت و مەهامەکانی بەرجەستە بکات، ڕێگا نادات هیچ سیستەمێك چاودێری بکات، قسە لە حوکمەکانی بکات، کاتێك سیستەمێکیش بەسەر کۆی سیستەمە کۆمەڵایەتیەکانیتر دەسەپێنرێت، ئەوا ژیانی ئەو کۆمەڵگایە دەکەوێتە بەردەم ڕەحمەتی فەلسەفە و سیستەمی سیاسی و دنیابینی سیاسەتکاران و ئەجنداى پارتە سیاسییەکانی ئەو وڵاتە، لێرەوە ئەگەر کۆمەڵگا خاوەنی ئەو سیستەمە سیاسی و ئەو دنیابینی سیاسەتمەدار و ئەجندای پارتە سیاسییانە بێت، ئەوا دەبێت بزانین کە ژیانی مەدەنیانەی مرۆڤەکانی لە مەترسیدایە، لە کۆمەڵگای ئێمەدا هێندەی ژیانی مەدەنیانە لە مەترسیدایە، هیچ شتێك لە مەترسیدا نییە، ئەوەش فەلجی فەلسەفە و سیستەمی سیاسی و دنیابینی سیاسەتکاران و ئەجندای پارتە سیاسییەکان نمایش دەکات، ئەوان با هەر باسی کۆمەڵگایەکی مۆدێرن بکەن، کە پڕیەتی لە ئازادی تاك و مافی مرۆڤ و سەروەری یاسا، دواجار ئەو قسانە تەنها بۆ ماسك و خۆجوانکردنە، بۆ خۆ ڕازاندنەوەیە، ئەگەرنا بەکارخستنەوەی بڕیاری لە سێدارەدان تەنها لە سیستەمە سیاسییەکانی لە شێوەی ڕژێمی دیکتاتۆر و شۆڤینیست و ڕاسیستەکانی سەردەمە جیاوازەکانی ژیان بوونی هەیە، ئەو

سیستەمە سیاسییانەی کە مرۆڤ بێبەهاترین بوونەوەرە لەلایاندا، بۆیە ئەم بڕیارە سیستەمی سیاسی کۆمەڵگای ئێمە بە سیستەمێکی دیکتاتۆر و تۆتالیتێر نمایش دەکات، ئەمەش نێگەتیڤیەتی ئەو بڕیارە پیشان دەدات.

* * * *

## ئاستی سێیەم: دروستکردنی جەلاد

ئاستێکیتری ئەو بڕیارە خۆبەخۆ دروستکردنی جەلادە، چونکە بۆ پراکتیزەکردنی ئەو بڕیارە پێویست بە کاراکتەرە، ئەو کاراکتەرەش ڕۆڵی جەلاد دەبینێت، بەلام جەلاد چییە؟ وەزیفەی کۆمەلایەتی جەلاد چییە؟ داخۆ ئەو وەزیفەیە چ جۆرە مرۆڤێك دەخوازێت، یا بە مانایەکیتر دەبێت تایبەتمەندی و خەسلەتەکانی ئەو مرۆڤە چی بێت؟.

جەلاد چەمکێکە کە ئاماژە بۆ کاراکتەرێك دەکات کە لە پرۆسەیەکدا ئەرکێك دەگێڕێت، ئەویش پرۆسەی سزادانی مرۆڤێکە کە حکومدراوە، لە زۆرترین باردا پرۆسەی کوشتنی ئەو مرۆڤەیە کە لەلایەن دەسەلاتداران و سیستەمی یاساییەوە حکومی لەناودان و لە سێدارەدانی دراوە، جەلاد ئەو کاراکتەرەیە کە هەر دوو پێکهاتە پێکهێنەرە گرنگەکەی (ڕۆح و جەستە) مرۆڤێك لێکجیا دەکاتەوە، کاراکتەرێکە لە چەند چرکەساتێکدا مرۆڤێك لە ژیان دیلیت دەکات، کەواتە جەلاد ئەو

کەسەیە کە کەسێکیتر لەناو دەدات و لە بووندا نەفی دەکات. جەلاد ئەو کەسەیە کە لەگەڵ کوشتن و کارەسات دەژییێت، ژیانی خۆی لەسەر کەللەسەری کەسانیتر بینا دەکات، ماڵی خۆی لەسەر خوێنی کەسانیتر بونیاد دەنێت، بە مانایەکیتر بە کوشتنی کەسانیتر ئەو دەژییێت، بە لەناودانی کەسانیتر ئەو درێژە بە ژیانی خۆی دەدات.

* * * *

لەبەرئەوەی جەلاد دەبێت کەسێك لەناو بدات، بۆیە بوونی جەلاد پەیوەستە بە بوونی قوربانی، کەواتە بۆ ئەوەی جەلاد هەبێت، دەبێت قوربانی هەبێت، هەر بۆیە جەلاد و قوربانی دوو جەمسەری تەواوکەری پرۆسەکەن. چەمکی جەلاد و قوربانی لەگەڵ بەسەرچوونی زەمەندا شێوازی جیاوازی بەخۆوە گرتووە، چۆن جەلادی جیاواز هەیە، ئەوا قوربانی جیاوازیش هەیە. دەشێت کەسی لەناودراو تاوانکار بێت و بەپێی حوکمەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی یا سیاسی یا ئایینی سزا بدرێت، هەروەها دەشێت قوربانی بێت. لە مێژووی نووسراوی مرۆڤایەتیدا چەندین کەس دەدۆزینەوە کە بوونەتە قوربانی و لە سێدارە دراون، زۆر شۆڕشگێڕ هەیە بەرگی خیانەتکاریان لەبەرکردوون و سزایانداون، مەرج نییە ئەوانە تاوانبار بووبن، بەڵکو تەنها نەیاری دەسەڵات و سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و شێوازی حوکمکردنی کۆمەڵگا بوون.

وەزیفەی جەلاد سزادان و ئازاردانی ئەو کەسەیە (تاوانکار یا قوربانی) کە لە ژێر دەستیدایە، ئەو لە ساتەوەختی براکسیس (مومارەسە)کردنی ئەرکەکەی جگە لە ئازاردانی ئەو کەسە هیچیتری لە خەیاڵدا نییە، ئەو وەکو هەر کەسێکیتری ناو کۆمەڵگا پەیڕەوی لە پڕاکتیزەکردنی ئەرکی سەرشانی دەکات، کردەیەك بە ئەنجام دەگەیەنێت لە ناو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیدا، لەلای جەلاد گرنگ نییە ئەو کەسەی لە ژێر دەستییەتی و سزای دەدات تاوانکارە یا قوربانی، چون ئەو کەسێکە وەزیفەی ئامێرێکی بێهەست دەبینێت، ئەو بیرناکاتەوە لەو کێشەیە، پێویستیشی پێ نییە، چونکە سروشتی ئەرکەکەی ئەوەیە کە تەنها کردەوە بە ئەنجام بگەیەنێت، تەنها فەرمان جێبەجێ بکات، نەوەکو بیر بکاتەوە لەوەی دەیکات، بیر بکاتەوە لەوەی دەرەنجامی ئەو کردەیەی چییە، ئەگەر بیریش بکاتەوە تەنها لەوەیە کە چۆن حوکمی دراو لەسەر کەسەکە پڕاکتیزە بکات، ئەوەش یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی کاراکتەری جەلاد.

* * * *

جەلاد کێشەیەکی گەورەی لەگەڵ ویژداندا هەیە، ئەو پەیوەندی لەگەڵ ویژداندا زۆر ناخۆشە، تاسەر ئێسقان ناتەبایە لەگەڵیدا، لە شەڕێکی دەستەویەخەدایە لەگەڵیدا، تا ئەو کاتەی بتوانێت ویژدان فەرامۆش بکات، ئەوا دەتوانێت بێ

خۆسەرکۆنەکردن و ئازار چەشتن ساتەکانی تەمەنی بەسەر ببات، بەڵام کاتێک ویژدان لێی بە دەنگ دێت، ئیدی خۆی سەرکۆنە دەکات، لەمەدا تووشی کێشەی دەروونی دەبێت، کەم جەلاد هەیە کێشەی دەروونی نەبێت، کەم جەلاد هەیە بەبێ خۆسەرگەرمکردن بتوانێت ساتەکانی تەمەنی بژیێت، جەلاد شەوانە بۆ نووستن، بۆ لە بیرچوونەوەی ڕووداوەکان، بۆ فەرامۆشکردنی کارەساتەکان، پڕ دەداتە ماددەی بێهۆشکەر، ئەوەندەی جەلاد ماددەی بێهۆشکەری پێویستە، هیچ بوونەوەرێکیتر پێویستی نییە.

جەلاد ژیانێک دەژیێت لەوە ناچێت هیچ بوونەوەرێک ئیرەیی پێ ببات، بۆ سەلماندنی ئەو قسەیە جەلادێکی مەغریبی دەڵێت "کابوسم هەیە، خەوم شێواوە، بەردەوام ژانە سەرم هەیە، هەست بە نامۆیی دەکەم، هەست بە زەلیلی و دڵەڕاوکێ دەکەم، وا هەست دەکەم کۆمەڵگا منی فڕێداوە، بەردەوام خۆم بە ڕووتی دەبینم، وا هەست دەکەم دەمەوێ بناغەیماڵەکەم لەسەر کەللەسەری مرۆڤەکاندا بونیادبنێم، جا ئەوندەی خۆڵیان بەسەردا دەکەم، ئەوان دووبارە دەردەکەونەوە، لە خەو ڕادەبم و هاوار دەکەم، ئارەق هەموو گیانمی داگرتووە"، لەم دانپیانانەدا بۆمان دەردەکەوێت کە جەلاد چ ژیانێک دەژیێت.

با لە چەند چرکەساتێکی کورت و بە خەیاڵ خۆمان بکەینە شوێنی جەلادەکان، با ڕۆڵی جەلاد ببینین، چەند ئەستەمە

هەزمکردنی دیمەنێك كە تێیدا تۆ بە تەنها پەنجەنان بە كارەبایەك، یاخود پەنجەنان بە پەلاپیتکەی تفەنگێك، مرۆڤێکیتر لە ژیان دیلیتکەیت، چەند ئەستەمە مرۆڤێك بە جوولەیەکی جەستەیی تۆ لە چرکەساتێکی دیاریکراودا لە ژیان نەفی بێتەوە، ببێتە کاراکتەرێکی نێو یادەوەری مرۆڤەکانی دەوروبەری خۆی. بە لەقەیەکی تۆ لە کورسییەك مرۆڤێك بکەیتە ناو دەفتەری یادەوەرییەکانی دەوروبەر و کەسە نزیکەکانی.

*　　*　　*　　*

لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هەزاران جەلاد بوونی هەیە، هەروەك سەدان شێواز و تەنکیکی کاری جەلادیانەش بوونی هەیە، لەگەڵ بەسەرچوونی زەمەندا کاری جەلادییانە و تەکنیکی سزادان گەشەیسەندووە، ئەمەش بەپێی بیرکردنەوەی باوی کۆمەڵگاکان بووە، لە سەرەتادا هەندێکجار پەلەکان (دەست و قاچ)ی کەسی سزادراویان لە دوو یا چوار ولاخی جیاواز بەستاوەتەوە و بە ئاراستەی پێچەوانەی یەکتر رایانکێشاون، تاوەکو جەستەی لەبەریەکتر دەردێت، (بۆ ئەمە سەیری کۆنترۆڵ و سزای میشێل فۆکۆ بکە).

هەندێکجار لە پێش چاوی خەڵك بە تەور لەسەر مەقسەلە سەری تاوانکار یا قوربانییان پەڕاندووە و لە جەستەیان جیاکردۆتەوە، بۆ ئەمە دەتوانین بڕینی سەری (چارلسی یەکەم و ماری شاژنی سکۆتلەندا) بە نموونە لە پاڵ سەدان نموونەی

دیکــە لــەو بــوارەدا بهێنینــەوە، ئــەم تەکنیکــە وردە وردە پەرەیسەند، تـا گەیشتۆتە ئـەوەی بـە (ژەهـر، چـەك، دەرزی، کارەبـا ...هتـد) ڕۆح لـە جەسـتەی کەسـەکە دەرکـەن و بیکـوژن، هــەموو ئەمانــە مانــای ئەوەیــە بــەردەوام ئــامێر و تــەکنیکی ســزادانی تاوانکـار یـا قوربـانی لـە گۆڕانـدا بـووە و لەگـەڵ بەرەوپێشـچوونی کۆمـەڵگا ئـەوانیش گۆڕانکارییـان بەسـەردا هاتووە.

*   *   *   *

لە کۆندا هەمیشە ئەو کەسە دەکرا جەلاد کە جەستەیەکی پتـەو و بـەهێزی هەبوایـە، چونکە ئـەم وەزیفەیـە پێویستی بـەم تایبەتمەندییــە هــەبوو، بــەلام لەگــەڵ گەشەســەندنی ئــامێری تەکنۆلۆژی و تەکنیکی لەناودانی (تاوانبار یا قوربانی)، ئیدی پێویست بەو تایبەتمەندییە ناکات، ئیدی گرنگ نییە جەلاد لـە ڕووی جەسـتەییەوە بـەهێزە یـا بێهێـز، قەڵـەوە یـا لاواز، بـەڵکو گرنگە فەرمانەکان جێبەجێ بکات و تایبەتمەندیەکانیتری تێدا بێت.

*   *   *   *

لـە مێـژووی ژیـانی مرۆییـدا جـەلاد شـێوازی جۆراوجـۆری بەخۆوەگرتووە، کاراکتـەرێك هەیـە بـە شـێوەیەکی فـەرمی بـەلام بـەنهێنی (لەبـەر هەنـدێك ئیعتبـارات) وەزیفـەی جـەلادە، ئەمـە

جەلادی دەسەڵاتە و بە بڕیاری لەسەرووی خۆیەوە بڕاکسیسی ئەرکەکەی دەکات، بەڵام جەلادی نادیار هەیە، جەلاد هەیە بە فەرمی ئەو ئەرکەی نییە، کەچی بڕاکسیسی ئەرکی جەلادییانە دەکات، لە نێو خێزانەکانی کۆمەڵگا پیاوسالارەکان (کورد بە نموونە)، بەردەوام پیاو جەلادە بەسەر ژن و منداڵەکانی، هەرچەند ئەم جەلادبوونەی پیاو بە فەرمی نییە، بەڵام ئاستێکی زۆر قووڵی هەیە و پانتاییەکی فراوانی لە ژیانی خێزان و ئەندامەکان داگیرکردووە، چاوسوورکردنەوە و سوکایەتیکردن و لێدان و ئەتککردن و کوشتنی ڕەگەزی مێ (ژن و کچ) بە دەست پیاو (کە بە ژمارە نایەت)، دیارترین نموونەی جەلادبوونی پیاو لە کۆمەڵگای پاتریارکی دەسەڵاتگەرا نمایش دەکات. ئەمەش جۆرێکی نادیاری جەلادە لە نێو کۆمەڵگا کە لە ژمارە نایەن و زۆرن.

*　　*　　*　　*

وا ڕاهاتووین کە جەلاد تەنها کەسێك بێت و سزا یا ئازاری کەسێکیتر بدات، بەڵام لە ڕاستیدا دەشێت جەلاد خۆی لەسەر شێوازی گرووپ و پارت و دەوڵەتیش بەیان بکات، بۆ نموونە گرووپی (شێخ زانا) لەسەرێکدا جەلادن، پارتێك لە کاتی شەڕیدا بەسەر پارتێکی بچووکتر جەلادن، دەشێت سزادانی دەوڵەتێك یا کۆمەڵگایەك لەلایەن دەوڵەتێکیتر و کۆمەڵگایەکیتر سزایەکی جەلادییانە بێت، کاتێك دەوڵەتێکیتر یا کۆمەڵگایەکتر

داگیر دەکات و دەیچەوسێنێتەوە، یا بایکۆتی دەکاتە سەر و لە نێو بەندینخانەیەکی گەورە (کە وڵاتەکەیەتی) بەندی دەکات و بە دنیای دەرەوەی دەپچڕێنێت و بە تەواوی جیای دەکاتەوە، ئەوە وەك ئەوە وایە تۆ گەلێك بخەیتە ناو بەندینخانەیەکی گەورە و ڕۆژانە وەك جەلادێك سزایان بدەیت و برسی و تێنویان بکەیت، سەرەنجام یەکە یەکە بیانکوژیت، ئەی نەبوونی ئاو و کارەبا و خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی و تەندروستی و گەیاندن مانای ڕاستەقینەی بەندینخانە نابەخشی؟ ئەی پچڕاندنی مرۆڤ بە دنیای دەرەوەی کۆمەڵگاکەی مانای بەندینخانە نابەخشێت؟ ئەی لێدان لە کاتی ناچۆنیەك و لە کتوپڕ مانای بەندینخانە ناگەیەنێت؟ ئەی ئازاردانی زنجیرئاسا بێپسانەوەی خەڵك مانای بەندینخانە ناگەیەنێت؟ دیارە لەوبارەیەوە نموونە گەلێك زۆرە پێویست بە ئامارە پێکردن ناکات. لەو ڕوانگەیەوە زۆرێك لە دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان بەردەوام لەسەر دەوڵەتان و کۆمەڵگاکانی ئەفریقیا و ئاسیا و ئەمریکای لاتین جەلادبوون، بەشێکی زۆری ژیانی ئەو دەوڵەتە ڕۆژئاواییانە ژیانی جەلادییانەیە، ئەوان لە مێژووی خۆیاندا تائێستا نەیانتوانیووە هەڵکەن بە بێئەوەی جەلادبن، ئەوان نووقمی نێو سیفەتی جەلادییانە بوون، تائێستاش نەیانتووانیووە تەپوتۆزی سیفەتی جەلادییانە لە خۆیان بکەنەوە، ئەوەی ئێستا ئەمریکا لە عێراق و ئەفغانستان و سۆماڵ و هەندێك وڵاتی دیکە

دەیکات، هیچ نییە جگە لە جەلادبوونی، هیچ نمایش ناکات جگە لە جەلادبوونی ئەمریکا نەبێت. بەهەمان شێوە بۆ بەریتانیا و ئیسرائیل و تورکیا...هتد، جگە لە جەلادبوونی رژێمی بەعس بەسەر گەلی کورد کە نموونەیەکی بەرهەستی زۆر نزیکە لە ئێمە.

* * * *

لە مێژووی نووسراودا بە تایبەتی لە سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپا یاری جۆراوجۆری جەلادییانە هەبووە، یاری جۆراوجۆری مەرگی هەبووە، بە تایبەتی ئەوانەی لە ناو یاریگا (arena)کان دەبینرا، ئەو یارییانە پرنسیپ و یاسای تایبەتی هەبوو، لە گرنگترینیان ئەوەیە یەکێك (جەنگاوەرێك) ئەویتر بکوژێت و لەناوببات، لەو یارییانەدا هەموو یاریچییەك بۆ ئەویتر جەلاد بوو، دیسان هەموو بۆ یەکتر قوربانی بوو، لە کاتی ئەو یارییانەدا جەماوەرێکی زۆر دادەنیشتن، چێژ و خۆشییان لە یاری قوربانی و جەلاد دەبینی، بە مردن و کوشتنی یارچییەك دڵخۆش دەبوون، پێدەکەنین و فیکەیان لێدەدات، بە قوربانیبوونی کەسێك و جەلادبوونی کەسێك دڵخۆش دەبوون، لەم یارییەدا ئەوەی ئەمڕۆ جەلاد با، بەیانی دەبووە قوربانی، چونکە جەلادێکی لەو باشتر و بە تواناتر دەهاتە مەیدانی یارییەکە. هەر بۆیە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بە هەزاران شێوە جەلاد و قوربانی دەبینرێن.

* * * *

هەمیشە جەلاد پەیوەستە بە دەسەڵاتی بەڕێوەبەری کۆمەڵگا، هەمیشە جەلاد لەگەڵ دەسەڵات بووە، کەم دەسەڵات هەبووە پێویستی بە جەلاد و پیاوکوژ نەبوو بێت، لە شوێنێکدا جەلاد ئێماژەیە بۆ دەسەڵات، دەسەڵات لە ڕێگەی جەلادەوە درێژە بە تەمەنی خۆی دەدات، بەو پێیەی نەیارەکان و دوژمنەکانی لە ناو دەبات، بەڵام ئایا بەردەوام یەکجۆرە دەسەڵات هەبووە؟ بێگومان نەخێر گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، لێرەوە چۆن دەسەڵات گۆڕانکاری بەسەرداهاتووە، ئاواش جەلاد، زۆرجار لەگەڵ نەمانی دەسەڵاتێکدا جەلادەکانیش هەمان چارەنووسیان هەبووە، لە مێژوودا زۆرجار دوای ڕووخانیان دەسەڵات و جەلاد پێکەوە لەلایەن نەیارەکانیان حکومکراون، بەمەش جەلاد و قوربانی شوێنیان لە پرۆسەکەدا گۆڕاوە، بەو مانایەی ئەوانەی دوێنی جەلاد بوون ئێمڕۆ قوربانین، بە پێچەوانەشەوە ئەوانەی دوێنی قوربانین ئیمڕۆ جەلادن، دەشێت بەیانیش هاوکێشەکە بە شێوەیەکیتر بگۆڕێت کە ئەمە زیاتر پەیوەستە بە حوکمەکانی بەیانی.

لە پرسی شێخ زانادا ئەو پرسە بە تەواوی دەسەلمێندرێت، ئەو گرووپە لە جێکەوتەی هاوکێشەکەدا دوێنی جەلاد بوون، ئیمڕۆش قوربانین، دوێنی وەکو جەلاد خەڵکیان دەکوشت، ئیمڕۆش وەکو قوربانی (یا تاوانکار) دەکوژرێن، گرووپی (شێخ زانا) دوێنێ دەسەڵاتیان هەبوو،

خەڵکیان دەکوشت، ئیمڕۆش کە دەسەڵاتیان نییە دەکوژرێن، دوێنێ سەر و جەستەی خەڵکیان لێکجیا دەکردەوە، ئیمڕۆش لە سێدارە دەدرێن، ئەوەیە کە زەمەن ناوەستێت و مێژوو حوکمی خۆی دەدات، بەڵام لە بیر نەکەین مێژوو لە حوکمی خۆیدا بەردەوام لەگەڵ بەهێزەکانە.

*          *          *          *

لە ڕاستیدا قەسەکردن لەسەر پرسی جەلاد زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێت کە لێرەدا باسمان کردووە، بەڵام لێرەدا جێیدەهێڵین و دەچینە سەر مەبەستی وتارەکە، ئەویش ئەوەیە پەرلەمانی کوردستان بە زیندووکردنەوەی ئەو بڕیارەی ناڕاستەوخۆ هەوڵیداوە جەلاد دروست بکات. پرسیار لێرەدا ئەوەیە ئایا ئەو واقیعە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووریەی کۆمەڵگای ئێمە جەلادی کەم تیایە؟ ئایا ئەو واقیعە پێویستی بەوە هەیە بڕیاری وای بۆ دەربکرێت کە جەلاد دروست بێت؟ ئایا لە کوێدا گرنگە ئەو بڕیارە دەربکرێت؟ خۆ لە ئەزموونەوە دەرکەوتووە زەروورەتی دەرکردنی هەر بڕیارێك دەگەڕێتەوە بۆ ئەمرەکانی واقیعی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا، واتا واقیعی کۆمەڵایەتی دەیسەپێنێت، بەڵام ئایا واقیعی ئەو کۆمەڵگایە ئەو بڕیارەی زەروورە؟ باشە خۆ پەرلەمانی کوردستان کادیر و پسپۆڕی بواری مافناسی تێدایە، خۆ کەسانی وای تێدایە ڕێکلامی ماف مرۆڤ و ژیانی مەدەنییانە و شارستانییانە دەکات، باشە ئەو

بڕیارە و ئەو حوکمە لەگەڵ کام لەم بوارانە دەگونجێت، زۆربەی هەرە زۆری وڵاتە پێشکەوتووەکانی دنیا لە سیستەمی دادوەری و یاسایی خۆیان ئەو حوکمەیان نەهێشتووە، دیارە ئەمەش لە خۆڕا نەبووە، بەڵکو زەروورەتێکی مێژوویی بووە، لە دەرەنجامی چەندین کۆڕ و سیمینار و کۆنفرانسی گەورە بووە، ئەی بۆچی ئێمە تازە زیندووی دەکەینەوە، ئێمە لە سەرێکدا دەڵێین کار بۆ بە مەدەنیکردن و بە مۆدێرنکردنی کۆمەڵگا دەکەین، لە سەرێکیتریشدا بڕیاری حوکمی لە سێدارەدان زیندوو دەکەینەوە، ئەوە گەورەترین دووفاقییەتی کۆمەڵگای ئێمە پیشان دەدات، زیندووکردنەوەی ئەو بڕیارە هەر چەندە لە سەرێکدا ئاماژەیە بۆ زیندووکردنەوەی جەلاد، ئەوا ئاماژەیەکیشە بۆ ئەوەی مافناس و پەرلەمانتار و کادیرانی مۆدێرنخواز بە ئاراستەیەك سەد و هەشتا پلە پێچەوانەی قسەو گوفتار و ڕێکلامەکانیان هەنگاو دەنێن.

واتێدەگەم لەم پرسەوە ئەو نهێنییەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە بۆچی لە ماوەی ئەو (14) ساڵەی ڕابردوودا پەرلەمانتاران تەنها کاراکتەرێك بوون بۆ دەست بەرزکردنەوە، تەنها کاراکتەرێك بوون بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی سەر کورسییەك، تێدەگەین بۆچی پەرلەمانتاران کاراکتەرێکی بێبەرهەم بوون، بۆچی بێکاریگەری بوون لەسەر کۆمەڵگا، تێدەگەین بۆچی ئەو بینایەی پەرلەمان جگە لە شوێنێك بۆ چای خواردنەوە و یەکتر

بینین و بە خەساردانی سەروەتی ئەو کۆمەڵگایە هیچیتر نەبوو، بۆچی ئەو باڵەخانە و ئەو پەرلەمانتارانە نەیانتوانی باوەڕی خەڵك بەدەست بهێنن.

لەم پرسەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بیرکردنەوە و دنیابینی ئەو پەرلەمنتارانە لە چ ئاستێکدایە، بۆیە بەدڵنیاییەوە دەڵێم نابێت بڕیارە چارەنووسسازەکان بدرێتە دەست ئەو کاراکتەرانە، چیدی نابێت ئەوانە بڕیاری چارەنووسساز و یەکلایکەرەوە لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی بدەن. چونکە کۆمەڵگا ئێمە پێویستی بەوەیە بڕیاری وا دەربکرێت کە جەلاد کەمکاتەوە، نەوەکو بە پێچەوانەوە جەلاد زیاد بکات.

بۆچی ئاسانە زیندووکردنەوەی بڕیاری لە سێدارەدان و کوشتنی کەسانێك کە هەڵەیان کردووە؟ ئاخر ئەو کەسانە ئەگەری چاکبوونەوەیان هەیە، واتێدەگەم کەسانێك ئەگەر مرۆڤدۆست بن، ئاسان نابێت لەلایان کە بڕیاری لە سێدارەدان زیندووکەنەوە، بە پێچەوانەشەوە هەر ڕاستە. باشە پەرلەمانتارەکان بۆ قسەیان لەسەر کەمکردنەوەی جەلاد و پیاوکوژەکانی کوردستان نییە، بۆ بڕیار لەسەر دز و جەردە و فاسدەکانی کوردستان دەرناکەن؟

بەو بڕیارەیدا پەرلەمان دەیسەلمێنێت کە پەرلەمانی کۆمەڵگا و ئەندامانی نییە، بەڵکو پەرلەمانی دەسەڵاتی سیاسی

و گرووپــە سیاســەتکارەکانی دوو پارتــە بــاڵا دەســتەکەی کوردستانە، پەرلـەمانی جێبەجێکردنی مەرامـە سیاسـییەکانی هەر دوو پارتی باڵادەستە. هەمدیسان بەو بڕیارەیدا پەرلـەمان دەیسەلمێنێت کـە چەند لـە ژیـانی مەدەنیانـە و شارسـتانییانە دوورە.

لەسەرێکدا لەبەرئەوەی ئەو دوو پارەتە ئەوەنـدە جەلادیان تێدایـە، بۆیـە ئاسـانە لەلایـەن پەرلەمانتارەکانیانـەوە بڕیـاری زیندووکردنـەوەی لــە سـێداران و دروسـتکردنی جـەلاد بـدەن، چــونکە کــەم نــین ئــەو پەرلەمانتارانــەی کــە دەســتیان لــە زیندووکردنــەوەی ئــەو بڕیــارە هەیــە، لــە شــەڕی نــاوەخۆدا ئەکتیڤانــە بەشــداریان کــردووە، دوور نییـە ژمارەیــەکی زۆری خەڵکیشیان کوشتبێت، واتـا دوور نییە جەلادیش بوون، بۆیـە زیندووکردنـەوەی ئـەو بڕیـارە و زیـادکردنی جـەلاد کردەیــەکی ئاسـاییە لـەلایان، بـەڵام ئایـا بـە ڕاسـت ئـەو کردەیـە ئاسـاییە؟ نـەخێر بـە هـیچ شـێوەیەك ئاسـایی نییـە بڕیـاری دروسـتکردنی جەلاد بدەیت، بڕیاری ئەوە بدەیت مـرۆڤ هەبێت سـەری مرۆڤیتر بپەڕێنێت، لـە کارەبای بدات، بیداتـە بەر گوولـە، بیکوژێت و لـە ژیان ڕەشیکاتەوە.

پەرلـەمانی خەوخۆشـان، پەرلـەمانی بێـدەنگان، پەرلـەمانی کوردستان بە زیندووکردنەوەی بڕیاری لـە سـێدارەدان، جەلادی زیاد کرد، پیاوکوژی زیاد کرد، ئەمـەش لـە سـادەترین ئامـاژەیـدا

چـــۆنیەتی بیرکردنـــەوە و دنیـــابینی و ئاســـتی هۆشـــیاری پەرلەمانتارەکان دیار دەکات. مرۆڤدۆستی و عەقڵانییەتی ئەوان دیار دەکات.

* * * *

## دەرەنجام:

بڕیاری لە سێدارەدانی گرووپی (شێخ زانا) بە بڕیارێکی عەقڵانییانـە و مرۆییانـە نـازانم، لەبەرئـەوەی یـەك زانیـاری لـە خـەڵك دەشـارێتەوە و ڕەوشـێکی ناشـەفاف لـە کۆمـەڵگا دروست دەکـات، لـە دەرەنجـامی ئەمەشـدا متمانـە لـە نێوانـە پەیوەنـدی هاوڵاتی و دەسەڵات کەم دەکاتەوە.

دوو ڕێگا لەبەردەم چاکبوونەوەی تاوانکار دەگرێت و بوار بـــۆ بـــە کۆمەڵایـــەتیبوونی ناهێڵێـــت، لەمەشـــدا باڵادەســـتی سیـستەمی سیاسـی بەسـەر سیـستەمەکانیتری نێـو کۆمـەڵگا نمـایش دەبێـت، دواجـار بـە بـوونی ئـەم ڕەوشـە ژیـانی کۆمـەڵگا دەکەوێتە مەترسییەوە.

سێ ئەو بڕیارە خۆبەخۆ دروستکردنی جەلادە، چونکە لـە ئاسـتی کردەییـدا ئـەو بڕیـارە پێویـستی بـە کاراکتـەرە بـۆ پراکتیزەکردنی، دیارە ئەمەش جەلادە.

جگە لەم سێ خاڵەی لەسەرەوە ئاماژەم بۆ کرد ئەو بڕیارە دەبێتـە هـۆی زیندووکردنـەوەی دیاردەیـەکی بێـزرا و دزێـوی

کۆمەڵایەتی، کە لەگەڵ خۆیدا هەم وێنەی کۆمەڵگا و سیستەمە سیاسی و دادوەرییەکەی دزێو دەکات، هەمیش دەرەنجامی کۆمەڵایەتی نێگەتیڤی دەبێت.

من ئەو بڕیارە بە بڕیارێکی عەقڵانییانە و مرۆییانە نازانم، لە ئاستی هزریدا تا سەرئێسقان لە دژی دەوەستم، پێویستە رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و چالاکڤانانی بواری ماڤ مرۆڤ لە دژی بووەستنەوە کار بۆ نەمانی بکەن، هەروەها باشترە لایەنە پەیوەستدارەکان پێداچوونەوەی بۆ بکەن و بیر لە نەمانی بکەن.

## پەراوێز..

* گرووپی (شێخ زانا) گرووپێك بوون (لەبەرهەر هۆیەك و بۆ هەر مەبەستێك) لە ماوەی چەند ساڵی رابردوودا رەفتاری تاوانکاریان ئەنجامداوە، ئەو گرووپە ناوی (گرووپی جیهاد)ە، هەروەکو لە کەناڵەکانی راگەیاندن بڵاوکرایەوە لە چەند کەسێك پێکهاتبوو، لە نیوەی ساڵی 2005 لەلایەن دەزگای ئاسایشی شاری هەولێر دەستگیرکران، لە رۆژی 21-9-2006 لە بەندینخانەی مەحەتەی شاری هەولێر، بە ئامادەیی نوێنەری هەر سێ وەزارەتی داد و ئەوقاف و تەندروستی، سزای لە سێدارەدانیان بەسەردا پراکتیك کرا، ئەوانەی لەو رۆژەشدا

گیانیان لە دەستدا بریتی بوون لە: زانا نەسرەت عەبدولکەریم بەرزنجی ناسراو بە (شێخ زانا)، بورهان تەلعەت محەمەد، ئەژی موعتەسەم عەبدولکەریم، فاروق ئیسماعیل عەبدوڵلا، دلێر حەیدەر عەبدوڵلا (مولازم دلێر)، یوسف عەزیز قادر، هەڤاڵ فاروق ئیسماعیل، کارۆخ بورهان محەمەد، مەریوان کەریم حەسەن، دلێر ئەبوبەکر ئیسماعیل (ناسراو بە دانا) و زیاد ڕەفعەت عەبدولکەریم. ئەمە بێجگە لە (کارزان ئیسماعیل عەلی) کە سزای هەتا هەتایی بۆ دەرچووە.

** لە ڕاستیدا کێشەی من نییە ئەو گرووپە چین، سیاسیین یا کۆمەڵایەتین، تاوانکاری ڕێکخراون یا تاوانلێکراو، جەلادن یا قوربانین، ئەو گرووپە هەر چییەك بێت پەیوەندی بە خۆیانەوە هەیە، بۆیە من بەرگریان لێناکەم، لە ژیان هەر کەس باجی ڕەفتاری خۆی دەدات، بە تایبەتی کەسانی لادەر و تاوانکار، بەڵام کێشەی من زیندووکردنەوەی ئەو بڕیارەیە، ئەو بڕیارە ئەگەر بەسەر هەر کەسێکدا پڕاکتیزە بکرێت (بەبێ لەبەرچاوگرتن و بەهەند وەرگرتنی کەسەکە)، ئەوا من لە دژی دەوەستەمەوە، چونکە پێموایە بڕیارێکی ناهیومانی و ناعەقڵانییە، بۆ ئەمەش هەروەکو لە وتارەکەدا ئاماژەم بۆ کردووە بنهۆی خۆم هەیە.

## سەرچاوە..

بۆ نووسینی ئەو وتارە سوود لەو سەرچاوانە وەرگیراوە

1/ تاوانبار و سزا – سابیر بەکر بۆکانی – دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم- 2002

2/ لێکچەری د.نوری هەرزانی – کورسی دووەم، قۆناغی سێیەمی کۆمەڵناسی، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین – ساڵی 2004-2005

3/ رحلة في دماغ جلاد – حوار عبداللطيف العزيز مع جلاد مغربي – مجلة صوت الشعب، عدد 247 ، 2006/7/7

4/ لە سێدارەدان.. ملێکی درێژ و مردنێکی لەسەرخۆ- عەدنان ئەبو زێد – ئا: هندرێن شێرزاد – ژمارە 2401ی رۆژنامەی خەبات.

# شێخ زانا کارەکتەرێکیتری تەلەڤزیۆنی کوردی

دەسـگیرکردنی (شـێخ زانـا) و هاوڕێکـانی و نیـشاندانی دانپیانانـەکانیان لەسـەر شاشـەی تەلـەڤزیۆن، بـووە بابـەتێکی سـەرەکی ئـەم ڕۆژانـەی شـەقامی کـوردی، پرسـیارگەلێکی زیندووی ترسئامێزی هێنایەوە یادی کۆمەڵگا، ئەوەش بەڵگەی ئەوەیـە کـە ئـەو سـتراتیژەی دامـەزراوێکی وەك تەلـەڤزیۆن مەبەستی بوو هاتـەدی، بەوەی قسەکردنەکان بگوازینـەوە سەر ئـەو گرووپـە تیرۆریـستییە، دیـارە ئـەو دانپیانانـە هێنـدەی ئیـشکردن بـووە لەسـەر سـۆز و هەسـتی هاوڵاتیـانی ئـەم کۆمەڵگایە، هێندە توانای خوڵقاندنی دیدێکی زانستی نییە بۆ ئـەو سـتراتیژەی کـە تیرۆریـزم، بـە قـەولی میـدیای کـوردی تیرۆریزمـی ئیسلامی لەوکارەدا مەبەستییەتی، تا ساتەوەختی ئەو نووسینەی ئێمە زۆر لەسەر ئەو دانپیانانـە نووسـران، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانی ئێمەیە، ئەو نووسـینانە هێندەی

لــە هــەناوی خۆیانــدا ڕقێکــی گــەورە بەرهــەم دێــنن، بــە هــیچ چەشــنێك نــەیانتوانیووە قــسە لــە هۆکــار و ســەرهەڵدان و ستراتیژی ئـەو کـارە تیرۆریـستییە بکـەن، هێنـدەی هەوڵیانـداوە هەر ئەو هەستە سـادەیەی میـدیای دەسـەڵات بگوازنـەوە بۆمـان، تاوەکو دوژمنەکانی دەسەڵاتی کوردی بکەینـە دوژمنـی خۆمـان، بێئـەوەی هـیچ قسەیەکیتر لـەو بارەیـەوە بکـەن، کـە ئـاخۆ ئـەو ڕووداوە ڕووداوێکــی نــامۆ بــوو بــە کۆمــەڵگای کــوردی، وەك نووسەرانی حزبی وایان ڕاڤە کرد، تا کار گەیشتە ئەوەی لەسەر شاشـەی تەلەڤزیۆنـەکان لـە ژێـر نـاوی ڕاڤـەکردنی ئـەو ڕووداوە وتیـان (شـێخ زانـا) هێنـدە بـە ئێمـە نامۆیـە تـا ڕادەی ئەوەی ئەو کوشـتن و سێکـسی وەك یـەك سـەیر کـردووە، بـە وتـەی ئـەوان دنیای کوردی خاڵییە لـە ئارەزووی مەرگدۆستی، نووسـەرێکیتر ستوونێکی ڕۆژنامەوانی نووسیوە و گلەیی لە نووسەران ئەوەیە کە بۆ تائێستا قسەیەك لەو ڕووداوە ناکەن کە بە دژی هەموومان بوو، ئەدی بۆ سارتەر وتـی "شـەرمەزاریمان لـە جەزائیر" هێنـدە بـەزەیم بـەو سـتوون نووسـە هاتـەوە، بـە ڕادەی ئـەوەی کـە ئـەو ئازیزە بیری چوو بـوو سـارتەر ڕەخنـەی لـە دەسـەڵاتی سیاسـی وڵاتەکەی خۆی گرتبوو، کەچی ئازیزانی ناو حزبی ئێمە، دەبابە و ڕاجیمە و لەشکر بە بەر چاویانەوە، حزبەکانیان دەیهێننـە نـاو کوردستان نوقەیان لێوە نایـەت، کەچـی دەشیانەوێ لەگـەڵ ئـەو ڕووداوە بڵێین "ڕەگی تیرۆرمـان لـە بنـەوە هەڵتەکانـد و تیرۆریـزم

لە کوردستان شوێنی نابێتەوە"، هیچ گومان لەوەدا نییە ڕۆشنبیرانی تەقلیدی حزب لەگەڵ بینینی وتاری لەو چەشنە هەموو تەفسیرەکانیان لەوە کورت دەکەنەوە، کە گوایە ئەو نووسینانەی وەك ئەوەی لەبەردەستدایە، داکۆکیکردنە لە تیرۆریزم، هۆیەکەشی زۆر ڕوونە، لای ئەو جۆرە نووسەرانە دنیا لە نێوان دوو لایەندایە، یا لەگەڵ ئەو ڕووداوەیت و تیرۆریستی، یاخود دەبێت وەك ئەوان بە زمانی میدیای دەسەڵات قسە بکەیت، وەك ئەوەی هەموو ستایشەکان بە نووسینی جدی وەرگیران، کەچی کاتێ نووسەر و مامۆستایەکی زانکۆی وەك (ڕێبوار سیوەیلی) لە دیمانەیەکدا لە ڕوانگەی کۆمەڵناسییەوە لەو ڕووداوە دوا، ئەنجومەنی پارێزگا کەوتە ڕوونکردنەوە دەرکردن و نووسەرانی ستایشکار وەك کوفرێکی ڕووناکبیرێك سەیری ئەو دیمانەیان کرد، کە لە درێژەی ئەو وتارەدا ئێمە هەوڵ دەدەین لە تەواوی ئەو بۆچوونانە نزیك بکەوینەوە، لە ڕوانگەیەکی ڕەخنەییەوە سەیری وتارەکان و دواتر سەیری بەیاننامەکەی ئەنجومەنی پارێزگای هەولێریش بکەین، سەرەتا ڕاستەوخۆ دێینە سەر مەبەستی ئەو وتارە کە ئەویش تەنها ڕەخنەگرتن نیە لە عەقڵییەتی باوی میدیای کوردی لە بەرامبەر ڕووداوێك، هێندەی قسەکردنە لەسەر ڕۆڵی دامەزراوی تەلەڤزیۆن، بەوەی ئەو دامەزراوە بەرهەمی چ دۆخ و قۆناغێکە و ئەزمونی ئێمەش لە تەك ئەو دامەزراوە چۆنە؟ کارەکتەرەکانی

تەلەڤزیۆن چۆن پەڕیونەتە ناو ژیانی کوردی؟ هەر لە جەلادێکی وەك (سەدام حوسێن) تا دەگات بە (شێخ زانا). کارەکتەرەکانی ئەو دامەزراوە کارەکتەری سیاسیین و بەشداری لە کوشتنی خەون و زەوتکردنی ژیان دەکەن، ئەو دامەزراوە گوزارشت لە ئایدیای دەسەلاتی دەولەت یا حزبی دەکات، ئەوەش بە دوای گەشەکردنی ئەو دۆخەی کە تازەگەری هێناویەتییە بوون، کە تەلەڤزیۆن یەکێکە لە دەسکەوتەکانی تازەگەری، تازەگەری ئەگەر لە ڕووی ماددیەوە (شێتخانە، هۆلۆکۆست، هیتلەر، سەدام حوسێن، جۆرج بوش) بێنێتە بوون، ئەوە لە ڕووی عەقلییەوە (کۆپەرنیکۆس، گۆتەنبەرگ، تەلەڤزیۆن) دێنێت، ئەگەرچی ئەوەی دواتریان کە مەبەستی ئەو نووسینەمانە دەگۆڕدرێت بۆ تازەگەری ماددی، وەك لە عێراقی هەشتاکان بەعس توانی وا لەو دامەزراوە بکات. تەلەڤزیۆنی بەعس دامەزراوێکە لە تەواوی دەیەی هەشتاکانی عێراقدا دامەزراوێکە ئایدیای فاشیزمی بەعسی لە پشتەوەیە، وێنە و ڕەنگ و دەنگ کەنالی پەیوەندی کردنەوەی بەعسە بە زۆرە ملیٚ، لە بەرامبەر هەموو مالەکانی ئەو ولاتە، بەعس پێویستی بەوە نییە شەوانە سانسۆر بخاتە سەر ژیانمان، چونکە لە ڕێگەی ئەو دامەزراوە چاودێریمان دەکات و ئامۆژگاری و هەڕەشەمان بۆ دەنێرێت، وەك لە نیشاندانی وێنەی ئەو باوکەی کوڕەکەی نەچۆتەوە جەنگ، باوکەکە کوڕەکەی خۆی دەکوژێت، دواتر ئەو کارەی ناو

دەبرێت بە "نیشتیمان لە کوڕەکانمان شیرینترە" ئەو ناو بردنە بۆ ئەوەیە، دەبێت بەعسمان لە منداڵەکانمان خۆشتر بوێت، ئەو ئایدیایە کاتێ لە تەلەڤزیۆن نیشان دەدرێت، پەیوەندی بە دوو هۆکارەوە هەیە، یەکەمیان پەیوەستە بەوەی کاتێ منداڵەکان نەچوونە جەنگی بەعس، دەبێ بە دەستی خۆمان بیانکوژین. هۆکاری دووەمیش هەڕەشەکردنە لە هاولاَتیانی عێراقی کە گەر وانەکەن چارەنووسیان مەرگە، لێرەوە ئەو دامەزراوە گوتارێکی ڕۆشنی بەعس بەرهەم دێنێت لە ڕێگەی بینراوەوە، بینراو لە سەرجەم ئاستەکانی ژیانی ئێمە، ئەو دامەزراوەیە پلانی بۆ دادەنێت، وێنەی بەرەکانی جەنگ یەکێکە لەو تراژیدیا ڕۆژانەی یادەوەری عێراقی، بەوەی نابێت ئێوارەیەك بەعس شەڕی بیر نەهێنێتەوە، دەبێت بزانرێت ئەو کوشتارگەیە پاڵەوانێکی وەك (سەدام حوسێن) بەرهەمهێنەریەتی، ئەو وێنانە بۆ هەستکردن نییە لەلایان عێراقییەکان بەوەی هەستی ئازایەتیان لە ناو دروست بکرێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە بۆ ئەوەیە گیانی یاخییەتیان تیا بکوژرێت و مرۆڤی ترسنۆکی تیا دروست بکرێت، دیسان ئەوە تەلەڤزیۆنە بەعس وای لێدەکات تەنانەت بێژەرەکانیش سیمای تایبەتی و زمانی تایبەتی بەعس بن، دەرکەوتنی (ڕوشدی عەبدولساحب) بەسە بۆ ئەوەی بزانین ئەمڕۆ بەعس لە خۆباییە و کوشتارێکی گەورەی ناوەتەوە، ئەو بێژەرە کارەکتەرێکە بۆ ئەوەی دەنگی جەللادمان پێ

بناسێنێت، ڕاستە ئەوە (سەدام) نییە دێتە سەر شاشە بۆ ئەوەی بەیانی جەنگ بخوێنێتەوە، بەڵام بێژەرێکی وا لە ڕێگەی دەنگی بەرزەوە گوزارشت لە دەنگی خۆی ناکات، بەڵکو ئەوە دەنگی دیکتاتۆرە و لە ناو دەنگی ئەوەوە بەرجەستەی وێنەی (سەدام) دەکات. بەمجۆرە بەعس کارەکتەرەکانی تەنها بریتی نین، لە سەرۆك کۆمار و وەزیری بەرگری و کوڕەکانی جەللاد و ئەوانی خوار خۆیەوە، بەڵکو بێژەرەکانیش لە یەکتریی جیا دەکاتەوە، بەوەی کامیان دەبێت گوزارشت لە دەنگی ئەو و سەرکەوتنەکانی بکات، کامەشە ڕقی بەعس گەورە دەکات (نیهاد نەجیب) بێژەرێکە کە هاتە سەر شاشە، مانای وایە بەعس فێڵی لێکراوە و ئێرانییەکان لە بەڵێنێك پاشگەز بوونەتەوە، دەبێت بەعس تۆڵەی ئەو ناپاکییە بکاتەوە، وەك لە سنوور بەزاندنی ئێرانییەکان بۆ عێراق و گرتنی فاو لەلایان ئێرانییەکان، ئەو بێژەرە تایبەتمەندییەتی خۆی وەك هاوکارە پێشووەکەی وەردەگرێت، ئەو شێوە کارەکتەرانە یەکەمین کارەکتەرەکانی تەلەفزیۆنە لە ژیانی ئێمەدا، کە پێی ئاشنا دەبین، لەگەڵ ئەزموونی حوکمڕانی کوردی جۆرێك کارەکتەریتر دەناسین، ئەو کارەکتەرانە تاڕادەیەکی زۆر لەلامان جیاوازن لەوانەی پێشوو کە بێزاریان دەکردین، (مەسعود بارزانی) و (جەلال تاڵەبانی) ئەو دوو کارەکتەرەی ناو تەلەفزیۆنی کوردین، ئەوان دووکەسن دواجار کۆمەڵگا دەیانکات بە هێما بۆ

سیفاتەکانی پاڵەوانی کوردی، بەوەی فریادڕەسی ژیانن، بەڵام لەگەڵ شەڕی ناوخۆ و هاتنی نەوەیەکی نوێ کە بڕوای بەشەڕ نییە، وردە وردە سیفاتەکانی پاڵەوان بوون لە تەلەڤزیۆن تا ڕادەیەکی زۆر نەك هەر سیحرەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵکو دەچێتە ئاستیترەوە، بەوەی ئیدی ئەوە ئەو دوو کارەکتەرە سیاسییە بە تەنیا نوێنەرایەتی خۆیان ناکەن، بەڵکو کارەکتەریتر لە شوێنیان دەردەکەون، پارتی لە ڕێگەی نواندنە کۆمیدیاکانی(حەمکۆ) وە گوزارشت لە ئایدیای خۆی دەکات، لە بەرامبەر ئەوەشدا یەکێتی لە ڕێگەی سوود وەرگرتن لە دەنگی بازی (کەریم عوسمان)ەوە دەیەوێت مومارەسەی سەرکەوتنەکانی بکات، ئەو عەقڵییەتەی ناو تەلەڤزیۆنی یەکێتی دووبارەکردنەوەی هەمان ئەزمونی تەلەڤزیۆنی عێراقی سەردەمی هەشتاکانە، کە پێشتر نموونەمان بە جۆری بێژەرەکانی هێنایەوە، یەکێتی بۆ ئەوەی پێمان بڵێت کە ئەو لە شەڕی تەلەڤزیۆن سەرکەوتووە، لە کاتی شەڕی نێوان ئەو دوو هێزە کە بە شەڕی شیراتۆن و قەڵا ناسرابوو، بەوەی هەر یەك لەو دوو شوێنە سەنگەری هەریەك لەو دوو هێزە بوو، وتارێکی تەلەڤزیۆنی گەلی کوردستان تایبەت بوو لەسەر (حەمکۆ)، بۆ ئەوەی پێمان بڵێن کە ئەو سەرکەوتنە سەرکەوتنی کارەکتەری میدیای یەکێتییە، بۆیە وتارەکەش هەر بە (کەریم عوسمان) خوێندرایەوە، ئەو دوو هێزە واتێگەیشتن دەتوانن لە ڕێگەی ئەو

دامەزراوە کارەکتەری سەربەخۆی حزبی بونیاد بنێن، کەچی لە ڕاستیدا کەمکردنەوەی ڕۆڵی کارەکتەرە سەرەکییەکان، دواتر بواری بۆ ئەوەش کردەوە کە لە دوو شێوە کارەکتەریتر بێینە دوان، ئەوانیش (خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا) و (عەبدوللا ئۆجەلان)، یەکەمیان لە ڕێگەی ئەو دامەزراوەوە وێنە ئەرشیفییەکان قسە لە ئەفسانەیەك دەکەن کە ناوی ئەفسانەی بارزانییە، ئەفسانەیەك ئەو نەوە نوێیە بە هیچ چەشنێك نە بەشداری لەگەڵیدا کردووە، نەبەرەو پێشچوونێك دەخاتە ناو ژیان و خەمەکانی ئەوەوە، کارەکتەری دووەمیش (ئۆجەلان) لە سیمبولێکەوە دەبێتە دیلێکی ناو فڕۆکە، بە مانای ئەوەی دەشێ کارەکتەرە سیمبولییەکانی تەلەفزیۆنمان ئەوانیش دیلبکرێن، مەرج نییە ئەوان کارەکتەری نەگۆڕبن و شکست و نەبەزین نەزانن، نەکرێت ئێمە لە دەرەوەی ئەو جۆرە کارەکتەرانەوە سەیری ژیان بکەین، بۆیە ئەو دامەزراوە ئەمجارە کارەکتەرەکانی دابەش دەکاتە سەر فەزای جیاوازی هونەری و ئەدەبی و وەرزشی، ئەوەش پەیوەندی بەوەوە نییە تاچەند ئەو کارەکتەرانە هونەرمەند و گۆرانیبێژی سەرکەوتوون، چونکە ئەگەر وابێت چ ڕاستییەك لە پشت ئەوەوەیە هەموو کارەکتەرەکانی ناو تەلەفزیۆنی کوردی سیاسی خەباتگێڕ و سەرکەوتوون، بۆیە ئەمجارە لە ئاستی ناوخۆ کارەکتەرەکانی ئەو دامەزراوە پێکهاتووون لە (لەیلا فەریقی و زەکەریا و شەمۆ)

و لە ئاستی جیهانیشدا ئەوە (ڕۆناڵدۆ و گۆدەلوپی و ماریمار و جاك و ڕۆز و پرتوقالە و نانسی عەجرەم)ن، هۆیەکەشی زۆر ڕوونـە هەست دەکـات کارەکتـەرەکانی ژیـانی ئـەو لـەو کەسایەتیانە پێکهاتوون، بەڵام جارێکیتر تەلەڤزیۆنی کوردی بە کارەکتـەرێکیترمان دەناسێنێت کـە کارەکتـەری (شـێخ زانـا) و هاوەڵـەکانین، کـە کۆمەڵـە مـرۆڤێکن خـەریکی کوشـتن و یـەکتر گـاینن، ئەو کارەکتەرانـە چـۆن پێشوازی دەکـرێن و چ ڕقێك لـە بەرامبەریان دەبینرێت؟ وەك ئەوەی تەلەڤزیۆنی کوردی ئەوانی پێناساندین، ئـەوان گرووپێکـی ئیسلامین و کاریـان کوشـتن و سێکسکردنە، تەنانەت لەگەڵ یەکتریش، بە مانای ئەوەی ئەوان لـە هـەموو پێـوەندانگێکی ئـەخلاقی داماڵـدراون، هەڵبـەت ئاشکراکردنی گرووپـی لـەو چەشـنە جێگـەی ئومێـدێکی زۆرە، بەوەی هاوڵاتی هەست بکات تیرۆریستان دەسگیر دەکرێن، بەڵام ئـەوەی جێگـەی سەرسـوڕمانە، ئـەو گرووپـە چـەندین سـاڵە بەمشێوەیە کار دەکات و کارەکتەرەکانی کەسانی نزیکی دەزگا ئەمنییـەکان و دەسـەڵاتن، ئـەو هـەموو مرۆڤـە دەکوژرێـت و دەزگاکـانی ئاسـایش لـە نـاو بێدەنگییـەکی گـەورەدا دەژیـێن، نیشاندانی ئەو دانپیانانە بەر لە هەر شتێك قسەکردنەوەیەکیترە بـۆ دۆخێکـی نـوێ کـە پێمـان بڵـێن ئیسلامییەکان تیرۆریستن، دیارە بە هیچ شێوەیەك ئێمە نامانەوێت بڵێین ئیسلامییەکان لـە کـاری تـیرۆرەوە بـە دوورن، بـەڵکو مەبەسـتی ئێمـە لـەو دۆخـە

بێدەنگەی چەندین ساڵەی ئەو گرووپەیە کە ئاسایشی پارتی لێی نەهاتۆتە دەنگ، نەك هەر ئەو بێدەنگییە، تەنانەت وەك هێزی شەرعی لە ناو کۆمەڵگای کوردیدا کاریان کردووە، کوشتنی کۆمۆنیستەکان و خاوەن سینەماکان و خاوەن دووکانی مەشروب فرۆشی پەیوەندی بە جەبەرووتی ئەو گرووپەوە نەبووە، ئەوە بێدەنگی دەزگاکانی ئاسایشە وایکردووە ئەوان بێترس کارەکانیان ئەنجام بدەن، دەرکەوتنی خوتبەکانی (مەلا بەشیر) وەك کارەکتەرێکی ناو تەلەفزیۆنی کوردی هەر درێژەی ئەو دۆخە بوو، کە پارتی بە هەڕەشەی نەدەزانی بۆ سەر خۆی، ئەگەر ئەمڕۆ هاتونەتەوە سەر دۆسیەی تیزاب پێداکردن بە ژنان و هۆیهاکردن، کۆمیدیاکە لەوێدایەن کە بۆچی ساتەوەختی ئەو ڕووداوانە ئەو هێزە بێدەنگی هەڵبژارد؟ هەر بەوەندەش نا سەرۆکی هەرێم زیاد لە جارێك دەیەوێت پێمان بڵێت، کە ئەوان لە ئیسلامییەکان ئیسلامترن، ئەو نایەت وەك پرۆژەی نەتەوەیی سەیری ئەو دۆخە بکات، بەردەوام گفتوگۆکان دەباتەوە سەر ئیسلام، ئەگەرچی لەو نێوەندەدا قسەکردنەکان لەبارەی ئەوەی بە ڕاست ئەو گرووپە تیرۆریستی ئیسلامین و دەبێت لە ڕیشەوە هەڵبکێشرێن؟ بەرلەوەی قسە لەوە بکەین ئەوانە گرووپی ئیسلامین، یاخود گرووپێکی تیرۆریستی ئاساین، پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت لە ناو ئەو دۆخەی کە قسە لە تیرۆر دەکرێت، لایەنگرانی

ئـەو دەسـەڵاتە لـە مزگەوتـدا هەڵدەکوتنـە سـەر مەلایـەکی یەکگرتوو، دواتر کوڕەکەی بریندار دەکەن، دیارە تیرۆر (شێخ زانا) بیکات یا لایەنگری هێزێکیتر هەر تیرۆرەوە، دواجار دەبێت بیرمان نەچێت ئێمە لە کاتێکدا قسە بە تیرۆریستان دەڵێین، تا ئێستاکە نەمانتوانیووە لە عەقڵییەتی بیرکردنەوی خۆمانی بە دوور بگرین، ئەی کەوابێت چۆن بە دوژمنەکانمان بڵێین واز لە کاری تیرۆریستی بێنن.

ئێستا با بچینە سـەر ئـەوەی بە ڕاسـتی ئەوانـەی لـە تەلـەڤزیۆن بینیمـان تیرۆریـستی ئیـسلامی بـوون یـا کۆمـەڵێك مرۆڤـی بەدڕەوشـت؟ چـونکە دانپیانانـەکان بـە هـیچ چەشـنێك ئامـاژەی بـۆ موسـوڵمانبوونی ئـەوان نـەدەکرد، ئەگـەر سەرکردایەتی گرووپـی ئیـسلامی کـاری بەدڕەوشـتی لـە جـۆری هـەتیوبازی بکـات، ئـەوا لـە ئاسـتی خـوارەوەی ئەندامـەکان ئـەو کارانـە ناکرێـت، لـە مێـژووی ئیسلامیـشدا بـە دوای مردنـی پێغەمبەر ئەوە سەحابەکان نەبوون بەو کـارە هەڵدەسـتان، بەڵکو لە ئاستی سەرەوەی دەسەڵات پیادە دەکرا والی و حوکمڕانەکان پێـی هەڵدەسـتان، (شـێخ زانـا) گـەر ئـەو کـارە بکـات ئـەوە ئەندامەکانی خوارەوە لەو کارەدا بڕوایان پێی نابێت، خۆ ئەگەر کارەکـەش هـەر بـۆ ناشـیرنکردنی ئیـسلامییەکانی ولاتـی ئێمـە بێت، ئەوە پێویست بە وێنەی بە وەهم کراو ناکات، چونکە زۆر وێنـەی ڕاسـتەقینە هەیـە کـە وەك خـۆی دەربخرێتـەوە، هـەر لـە

ژنهێنـانی یانـسیبی نـاو یـەکگرتوو، تـا دەگـات بـە کوشـتنی ماموّسـتایانی زانکـۆ و ڕووناکبیران و ئەنـدامی حزبـەکانیتر و دیاردەی سووتاندنی کتێبخانەکان، ئەگەر بە زمانی (بۆدریـار) بدوێین دەڵێین ئیسلامیەکان "بە مردنی خۆیان دەجەنگن" بەڵام گرووپەکەی (شێخ زانا) بە ئەندامی سێکسی دەجەنگێت، بۆیە ئەو کارە کەمتر توانای ئەوەی هەیە بە گرووپی ئیسلامی ناوی بەرێت، خۆ ئەگەر دانپیانانی سیاسی گەورەش هەبێت ئەوە دەبێت نیشانمانی بدەن، چونکە تائێستا نازانین ئەوانە ئەو کارانەیان بۆ کێ ئەنجامداوە؟ بۆ چ لایەنێك خەڵکیان کوشتووە؟ ئەگەر هەر بۆ هەوای نەفس بێت وەك وترا، ئەی بۆچی بەرلەوەی سەریان ببڕن تەحقیقیان لەگەڵدا کردوون؟ تەحقیقیان بۆ کێ لەگەڵ کردوون؟ ئەگەر لە تەحقیقەکە بێگوناه دەرچوون چی؟ پێویستە ئێمە ئەو پرسیارانە لە تەلەفزیۆنی کوردی بکەین، ئەگەر نا با جارێکیتر یا وێنەکان تەنها بۆ ورووژاندن نیشان نەدرێن، یاخود حەقیقەتی تیا نەشاردرێتەوە، خۆ ئەگەر مەسەلەکەش تەنها چیرۆکی کوشتنی لاوی کورد و دواتر سێکسکردن بێت لەگەڵ چەند ژنێك و تەنانەت نێربازیش ئەوە با بیرمان نەچێت ئەوکارە کارێکی نامۆ نییە، شەڕی ناوخۆ مێژوویەکی دەوڵەمەندی لەو بوارەدا هەیە، تاکە جیاوازیش تەنها هێندەیە تاوانبارانی ئەو کارانە لە کاتی شەڕدا نەهێنرانە سەر تەلەفزیۆن و لە خەڵکی شاردرانەوە ئەوانە هێندران، ئەوە

تەنها (شێخ زانا) و گرووپەکەی نین بەشدارن لەو تاوانە، بەڵکو کۆی ئەو سیستەمە ئەخلاقییەی کە دەسەڵاتی کوردی داکۆکی لێدەکات تاوانبارن، ئەوە بانگەشەی "ئێمە لە ئیسلامییەکان ئیسلامترین" بانگەشەیەکە بەردەوام شەرعییەت بەو جۆرە گرووپانە دەدات کە لە ژێر ناوی ئایینەوە بەمکارە هەڵبستن، بۆیە ئەوە مانای ئەوە نییە ئایین لەو جۆرە کارانە بێگوناهە، نا ئەوەیان باسێکیترە، ئەزمونی هێزە ئیسلامییەکان لە ساڵانی ڕابردوو شایەد حاڵی ئەو ڕاستییەیە، هێزە ئیسلامییەکان دنیا لە ناو یەك ڕاڤەکردنەوە سەیر دەکەن و ئەوەی لەگەڵ ئەو ڕاڤەکردنەی ئەوانیش نەیەتەوە دەیکوژن، بەڵام ئەوە دەسەڵاتی کوردییە شەرعییەتی بەو کوشتنە داوە، بەوە نییە ئەمڕۆ سەنگەری لێگرتوون، بۆیە ئەوە نە تەنها (شێخ زانا)یە تاوانبار و نە تەنها ئیسلامییەکانن، بەڵکو هەمووان لە بەرامبەر ئەو دۆخ و ڕووداوە ئابڕووبەرە بەرپرسیارین. وەك چۆن ئەو ڕووداوە لەگەڵ کۆتایی هاتن و دەسگیرکردنی، توانی تیرۆر و جەنگێکیتر بەرپا بکات کە (جەنگی تەلەڤزیۆن) بوو، ئەوەش لە ڕێگەی وێنەگرتنی تەواوی ئەو چالاکی و ڕووداوانەی ئەو گرووپە، بە دیکۆمێنتکردنی چیرۆکی تیرۆرە، بەڵام نیشاندانی ئەو فیلمە لە تەلەڤزیۆنەوە، لە دیکۆمێنتێکی (شێخ زانا)وە گۆڕیە سەر دەلالەتێکیتر، بەوەی تەلەڤزیۆن چیرۆکی تیرۆر لە گرووپێکەوە دەگوازێتەوە بۆ ماڵی کوردی، ئەوە بەو مەبەستە نییە، ئەو

دامەزراوە نهێنی گرووپێکی چەکدارمان بۆ دەربخات، بەڵکو بەر لە هەر شتێ دەیەوێ لەو جەنگەی خۆی گوتاری دەسەڵات رابگەیەنێت، لە ڕوویەکی تریشدا گوتارێکی نوێ لە دایک دەبێت، ئەویش گوتاری جەنگی تەلەڤزیۆنە لە بەرامبەر ماڵی کوردی. دیارە جەنگی تەلەڤزیۆن مێژووەکەی لەگەڵ (شێخ زانا) دەست پێناکات، بەڵکو ئەو جەنگە بۆ تەواوی دەیەی هەشتاکان دەگەڕێتەوە، بۆ ساتەوەختی جەنگی عێراق و ئێران، ئەو کاتانە لای تەلەڤزیۆنی بەعس جەنگی خۆی لە هەموو ماڵەکان بەرپا دەکرد، ئەو جەنگە بە تەنیا پەیوەندی نەبوو بە دیمەنی کوشتارگەکانی دەوڵەتەوە، بەڵکو جەنگێکی ڕێکخەر بوو لەسەر تەواوی پرۆگرامەکانی تەلەڤزیۆن، بەعس زۆر بە مەبەستەوە لەگەڵ کردنەوەی تەلەڤزیۆن بوونی خۆی ڕادەگەیاند، ئەو تەنانەت لە کردنەوەی بە سروودی نیشتیمانی و ئایەتی قورئان هێزی بە بوون و ڕەچەڵەکی خۆی دەگەڕاندەوە بۆ سەرچاوەیەکی ڕەسەن، تەنانەت بوونی فیلمی کارتۆن سەرەتای بردنە دنیایەکە بۆ منداڵ کە پەیوەندی بە خوڵقاندنی کارەکتەرێکەوە هەیە، کە هێزی بوون و مانەوەی لە جەنگ و سەرکەوتنی وەردەگرێت، بۆیە کارتۆنی منالآن کارەکتەرەکانی بریتین لە (گریندایزەر) و (دایسکی) و سەرکەوتنی بەسەر دێوە خورافییەکان، تەنانەت یەکەم فیلمی کارتۆنی عێراقی فیلمی (الامیرە النهر) کە کارەکتەرێکە بۆ گەیشتن بە خەونەکانی لە

ڕێگەی هێزی شەڕکردن و سەرکەوتن بەسەر دڕندە سەیرەکان دێتە دی، هەر ئەو منالأنەی ڕۆحیان بەو فیلمە کارتۆنیانە گۆش کراوە، ئەوانن دواتر لە عێراقدا دەبن بە جاش و مەفرەزەی تەواری. لێرەدا زۆر بە ڕوونی هەست بە هەردوو گوتاری (دەسەلأت) و (جەنگی تەلەفزیۆن) دەکرێت، ئەو دوو گوتارە لەگەڵ لە دایکبوونی تەلەفزیۆنی کوردی درێژ بۆوە لە ناو ئەو دامەزراوە، گوتاری دەسەلأت گوتارێکە لە ڕێگەی نیشاندانی سەنگەرەکان دەست پێدەکات، لە نیشاندانی گرووپەکەی (شێخ زانا)ش دەیەوێ پێمان بڵێت "دەستی پیاوانی ئاسایش دەگاتە هەموو شوێنێك، بۆیە هەرگیز بیر لەو سیستمە نەکەنەوە، کە گۆڕانی تیا ڕوو بدات"، هەمیشە ئەو گوتارە لەلایان دەسەلأتەوە تەلەفزیۆن بەو ئاقارەدا دەبات، ئەوەش گۆڕینی تەلەفزیۆنە لە دەزگایەکی کولتووریەوە بۆ دەزگایەکی سەرکوتکار، تەلەفزیۆن لەو دەزگا نوێیە دەبێ بە دەزگای ئایدیۆلۆژی دەسەلأت.

گوتاری دووەم کە گوتاری (جەنگی تەلەفزیۆنە لە بەرامبەر ماڵی کوردی) ئەو جەنگە لە ڕێگەی نیشاندانی فیلمی کوشتن و سێکسکردن و دانپیانانەکان دەست پێدەکات، ئەو گوتاری جەنگە پێویستی بە گوتاری یەکەم نامێنێت، چونکە بۆخۆی بە تەنیا وەك گوتارێکی سەربەخۆ توانای بەرپاکردنی جەنگی هەیە. بینەر هەست بە کاریگەری ئەو جەنگە ناکات، بۆیە شەوانە زۆر بە خۆشحاڵییەوە کاتی بۆ تەرخان دەکات، بێئەوەی

بزانێت کە ئەوە جەنگێکە لە دژی کۆبوونەوەی ماڵ و تێکدانی سیستمی خێزان و گۆڕینی ئاخاوتن و ژیان لە دۆخی سرووشتی خۆیەوە بۆ دۆخی جەنگی تیرۆری تەلەڤزیۆن، هەر لە یاری منداڵان کاتێ دەیانەوێ بۆ یارییەکانیان لاسایی کارەکانی (شێخ زانا) بکەنەوە، تا دەگات بە توانا توندوتیژییەکانی زمان کاتێ لە ناو خێزاندا مومارەسەی دەکرێت، ئەو کاتانەی پیاو هەڕەشە لە ژنەکەی دەکات کە گەر ژنەکەی بە گوێی ئەو ڕەفتار نەکات، ئەوا وەك (شێخ زانا) سەری دەبڕێت، یا ترسی خانمەکان لە دووکاندارەکان کە نەوەکو کامێرای شاراوەیان دانابێت، بۆیە جورئەتی خۆگۆڕین ناکەن لە دووکانەکان، هەموو ئەمانە بەرهەم و دەرەنجامەکانی جەنگی تەلەڤزیۆنە.

یەکێك لەو بابەتەی ئەو ڕووداوە لەگەڵ خۆی هێنای مەسەلەی مەعریفە بوو، بەوەی (شێخ زانا) دەرچووی زانکۆیە، ئەوەش بیانوویەك بوو بۆئەوەی ڕووداوەکە لە کۆڵ مزگەوت بکاتەوە، هەڵبەت خەڵکانێك هەبوون بڕوا بەو بیانووە سادەیە بکەن، ئەو بیانووە ستراتیژێکی ڕۆشنی لە پشتیەوەیەتی کە ستراتیژیی گەڕانەوەیە بەرەو مەعریفەی مزگەوت، چونکە ئەگەر مەعریفەی کوردی لە سەرەتادا مەعریفەی مزگەوت بوو بێت، بەوەی (مەلا) کارەکتەرێکی مەعریفییە و (فەقێ)ش کارەکتەرێکە دەیەوێ کارەکتەری یەکەم مەعریفەی پێ

ببەخشێت، لێرەوە مزگەوت بوو بەو دامەزراوە مەعریفیەی کە مەعریفەی ئایینی گۆڕی بە مەعریفەی کوردی، ئەو مەعریفەیە تا ئەو شوێنەی پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکانی شار و ئەو گەشەسەندنەی لە بواری بیناسازی و پێشڤەچوونی دامەزراوەکانی دەوڵەت لە ئۆرگانی مەعریفی بەرهەمهات، لە جۆری (زانکۆ، تەلەڤزیۆن، سەندیکا، میدیاکان) بە شێوەیەکی گشتی، ئەوا مەعریفەش لە گوندەوە پەڕیەوە شار، ئەو پەڕینەوەیەش لاوازکردنی مەعریفەی ئایینی بوو، ئەوە گەرچی شۆڕشی کوردی خۆی لەسەر میراتی مەعریفەی ئایینی حیساب دەکرد، بەوەش گوتاری ناسیۆنالیزمی کوردی گوتارێکە لە نێوان هەردوو ئاراستەی نەتەوەیی و ئایینی خۆی بەهێز دەکرد، بۆیە هەر لە شۆڕشی ئەیلولەوە تا دەگات بە قۆناغی بەرەی کوردستانی، مزگەوت بووە بارەگا و شوێنی کۆبوونەوەی شۆڕش، ئەوەش وایکرد شۆڕشی کوردی لە ناو مەعریفەی ئایینیەوە خۆی بە شەرعی بزانێت، بەلام لەگەڵ هاتنی بۆ شار، ئەوکاتەی خۆی بە ڕۆڵەی مەعریفەی نوێ دەزانێت، بەلام لە نێوان مەعریفەی گوند (مزگەوت) و مەعریفەی شار (زانکۆ) ئەو ناتوانێت ئاراستەیەکی جیاواز بۆ مەعریفە بدۆزێتەوە، هێندەی لە ناو دووفاقیەتی مەعریفی دەخولێتەوە، ئەوەش بە تەنها گوتارێك نییە بۆ هەیمەنەکردنی دەسەلات، هێندەی گوتارێکە لەسەر توێژەکانی خوارەوە ڕەنگ

دەداتــەوە، هــەر بۆیــە ئەوکاتــەی لــە ئاســتی ســەرکردایەتییەوە پارتییــەکان قــسە لــە ئیــسلامبوونی پــارتی دەکــەن.. نــەك لــە نەتەوەیی بوون، ئەوساتە دەرفەتی دژایەتیکردن بۆ مەعریفەی شار ڕەنگ دەداتەوە، ئەو دژایەتییە لە ئاستی سەرکردایەتیدا نامێنێتەوە، بەڵکو دەپەڕێتەوە بۆ ناو خانەکانی ڕێکخستن و تا دەگات بە وتاری نووسەرە حزبییەکانی ئەو هێزە، باشترین نموونە بۆ ئەو حالەتەش ئەوەتە گەنجێکی نووسەری ئەو حزبە بــۆ ڕەخنــەگرتن لـــە عەقڵییـــەتی بـــاوی شـــار دەنووســـێت "با(میوان)ەکانی هەولێریش بزانن خەڵکی هەولێر گرنگی بە لێکدانــەوە فەلــسەفی و سۆسـیۆلۆژییەکانی ئــەوان نــادەن"، گرنگی نەدان بە فەلسەفە و سۆسیۆلۆژیا ستراتیژێکی سەرەکی هەردوو دەسەڵاتە سیاسییەکە بووە لە شاری هەولێر، بۆ ئەوەی ئەو شارە لە ناو مەعریفەی گوند ڕزگاری نەبێت، بۆیە هەریەکە لە هێزە دەسەڵاتدارەکانی وەك (یەکێتی و پارتی) دەسەڵاتی ئایینیەکان (حزبە ئیسلامییەکان) بەیەکەوە بەشداری لەو دواکەوتنە دەکەن، یەکێکیان گەنجەکان فێر دەکات بڵێت هەولێرییەکان پێویستیان بە فەلسەفە نییە، ئەویتریشیان (شێخ زانا) بە دەرچووی زانکۆ ناو دەبات. لە بەرامبەر بۆچوونی هەوادارانی هەریەکە لەو دوو تێڕوانینە دەبینین ئێمە خاوەنی بۆچوونی جیاواز نین، بەڵکو سەر بەیەك بۆچوونی لە یەکچووین، تیایدا بە هەردوولا دڵسۆزی بۆ مەعریفەی ئایینی

دەنــوێنن، ئەگــەر ئیــسلامییەکان پێیانوابێــت ئــەوان کــوڕی مەعریفەی مزگەوتن، مەعریفەی شار بە بەرهەمی کوفر و عەقڵی خۆرئاوایی تێبگەن، کە ئەوەیان کارەسات نییە، بەڵکو کارەسات لەوەدایــە هێــزە دەســەڵاتدارەکانی بانگەشــە بــۆ دیموکراســی و عەلمانییــەت و کۆمــەڵگای مــەدەنی دەکــەن، ئــەوان خۆیــان بــە دوژمنــی سەرســەختی مەعریفــەی نــوێ بــزانن، بــەڵام بۆچــی ئــەو تێڕوانینەی دەسەڵاتی کوردی تەنها لــە هەمبــەر شــاری هــەولێردا وایــە؟ چــونکە هەریەکــە لــە یــەکێتی و پــارتی وا ســەیری بنکــەی جەماوەری خۆیان دەکەن کە یەکێتی سەنتەرەکەی لە سلێمانییە و پارتیش بادینان و بە تایبەت شاری دهۆك بە سەنتەری خۆی ســەیر دەکــات، هــەولێر بــۆ هــەردوو حزبەکــە شــارێکە یــەکلایی نەبۆتــەوە، نوکتــەکردن لەســەر هــەولێریی بــەوەی ئــەوان خــەڵکی دواکــەوتوون، بەرهــەمی ئــەو عــەقڵ و تێگەیــشتنەیە، بۆیــە ئــەوە مامۆستایەکی زانکۆ نییە کە هەولێر سووك دەکات، بە پێچەوانە ئــەوە یــەکێتی و پــارتین ئــەو شــارە بەهەنــد وەرنــاگرن و بــە کــەم ســەیریان کــردووە، ئەگەرچــی کــاتی خــۆی کــە وتارێکمــان لــەو بارەیــەوە نووســی خــەڵکانێك واتێگەیــشتن دنیــا بەســەر زەوی ڕووخــا، تــا کــار گەیــشتە ئــەوەی ســەلەفییەکی تازەگــەر بــووە زمانحاڵی دەسەڵاتی کوردی، داکۆکی لە هەموو ئەو ناشیرینیانە کــرد، کــە بوونەتــە هــۆی بونیادەکــانی دواکــەوتن لــەو شــارەدا، ئەگــەر ئــەو نووســینەش بــە هــەمان ئاقــاردا ببردرێــت دیــسان

بەلامانەوە ئاساییە، چونکە دەسەلاتی کوردی و لە ناویشیاندا نووسەرەکانی و سەلەفییە تازەگەرەکانی بڕیاریانداوە هەرگیز ئامادە نەبن لە هیچ تێبگەن. دەبێ لە سەرجەم دامەزراوەکان سەرلەنوێ پرسیار لە چییەتی مەعریفە بکەینەوە، (شێخ زانا) لە ناو مزگەوتەوە هاتبێت یا لە زانکۆ، گوزارشت ناکات لە یەکێك لەو دوو دامەزراوە، وەك چۆن دامەزراوەکان بێگوناه نین، بەڵکو گوناهبارن لەوەی زەمینەی توندوتیژی لە ناو کارەکتەرەکانیان ناکوژن، پێویستە مەعریفەی کوردی بخرێتە ژێر چاودێری و رەخنەوە، ئەو مەعریفەیە دەبێ لە رێگەی هەڵوەشاندنەوەی سێنتەرەکەیەوە بخوێنرێتەوە، بێباك لەوەی دەنگە ئایدیۆلۆژییەکان چۆن سەیری ئەو پرۆسە هەڵوەشاندنەوەگەرایە دەکەن، پێویستە کۆی ئەو سیستمە ئەخلاقییەی ماڵی کوردی لە دڵنیابوونەوە بگۆڕین بۆ گومانکردن لە سیستمی ئەخلاقی ماڵ، بەوەی گەر ماڵ پێیوابێت دەبێت منداڵەکانی لە کۆتایی هەفتە گوێ لە وەعزی ئایینی بگرن، ئەوا ئەمڕۆ چیتر مەلاکان خوێنەوارترین توێژی ناو کۆمەڵگانین، ئەو تێگەیشتنە نوقمە لە ناو خورافات، لە ناو ئاییندا خۆی شاردۆتەوە، تەلەڤزیۆنی کوردی ڕۆڵێکی کاریگەری هەبووە لەسەر پەخشکردنی ئەو وەعزە ئایینیانە، ئەو دامەزراوە کە ئایدیایەکی ئایینی بە دەسەلاتی کوردی دەبەخشی، ئەمڕۆ ئەو ئایدیایە کەوتۆتە بەر توندوتیژی، هەق

وایــە لایــەنگرانی دەســەڵاتی کــوردی پرســیاری ئــەوە لــە دەســەڵاتەکەیان بکــەن یــانی چــی ڕۆژێــك وەعــزە ئایینیــەکان دەگوازنــەوە، ڕۆژێکـیتر (شـێخ زانـا) بـە بەرهــەمی نـاو ئـایین دەناسێنن، ئەوانەی ئەمڕۆ پێیان دەوترێ ئیسلامی ڕاستەقینە نـین، هــەر ئـەوان بـوون ڕۆژگارێـك خوتبـەکانیان لـە تەلـەڤزیۆن نیـشان دەدرا و کاسێتەکانیان لـە نـاو بـازاڕدا دەفرۆشـرا، ئـەو گەمەیە ناوی چییە؟ با لایەنگرانی هێزی بە ناو عەلمانی کوردی داوا لــە هێزەکــەی بکــات وەڵامــی بداتــەوە. بــۆ ئێمــەش گــەر پرسیارێکیترمان بخاتە بەردەم ئەوەیە: ئاخۆ تەلەڤزیۆن لە ناو هەڵــچوونێکی ئایدیۆلۆژیــدا دانــەنراوە، بــەوەی ســبەینێ ســەرلەنوێ ئــاین لــە نــاو خۆیــدا کــورت بکاتــەوە؟ دیــارە پرســیارکردنەوە لــە مەعریفــە بــە تــەنیا پرســیار نییــە لــە دامەزراوێکی وەك مزگەوت، بەڵکو پرسیارێکی توندە بە ڕووی دامــەزراوێکی وەك زانکـۆش، بەوەی مەعریفـەی تـۆزڵێ نیشتوو، دەبێتە هۆی ئەوەی گومان لەو سیستمە عەقڵییە بکەین کە ئەو دامەزراوە بەڕێوە دەبات؟ ئەو دامەزراوە دەبێت لەوە تێبگات کە ئـەو بەرهـەمی شـار و تازەگەرییـە، نـەوەك بەرهـەمی عەقڵییـەتی بـاوی کۆمەڵایـەتی، بۆیـە هەریـەك لـەو دوو دامـەزراوە پێویـستە بەخۆیانــدا بــچنەوە، بــەوەی یەکــەمیان بەرهــەمی دۆخ و عەقڵییـەتێکی ئایینیـە، بـەڵام بـە هـیچ شـێوەیەك نابێـت ئـەمڕۆ چاوەڕوانی ئەوە بێـت کـە ئـەو شـوێنی لـە دایکبـوونی مەعریفـە

بێت، وەك چۆن زانكۆش دەبێت بە پرسیاركردن لە چییەتی مەعریفە بچێتەوە و چیتر چاوەڕوانی ئەوە نەبێت مەعریفەی جیاواز و دید و تێڕوانینە نوێیەكان لە خۆیدا بكاتەوە دەرەوە.

دیارە یەكێك لە ستراتیژەكانی دەرخستنی وێنەی دانپیانانەكە كە دەسەڵات مەبەستی بوو، ستایشكردنی بوو لەلایان ئەو توێژەی كە بە ڕۆشنبیر ناو دەبرێت، ئەوەش بۆ گۆڕینی هەموو ڕەخنەگرتنێك بوو لە دەسەڵات بۆ ئەوەی كۆتایی بە ڕەخنە بێنین و ستایشی پاڵەوانەكانی ئاسایش بكەین، ستایشی ئەو دامەزراوەی هەمیشە ڕۆڵی سەركوتكردنی گێڕاوە، بۆ ئەوەی لەو ستایشەوە قبووڵی هیچ تێڕوانینێكی جیاواز نەكات، هەربۆیە ئەوكاتەی (ڕێبوار سیوەیلی) لە دیمانەیەكی هەفتەنامەی میدیا هەولێدا تاڕادەیەك لەو بۆچوونە ستایشكارە دووركەوێتەوە، لە چەند سەرنجێكی كۆمەڵناسییانەوە سەیری ڕەگی ئەو ڕووداوە بكات، خێرا نووسەرانی دەسەڵات كەوتنە وەڵامدانەوەی، لەولاشەوە ئەنجومەنی پارێزگای هەولێر دوو ڕوونكردنەوەی جنێو ئامێز و هەڕەشەی بڵاوكردەوە، بۆ ڕێگەنەدان بە دەنگی جیاواز و تێكشكاندنی وێنەی ستایش و خوڵقاندنی زەمینەی ڕەخنەگرتن لە دۆخێك كە بەرپرسیارەكەی دامەزراوەكانی دەسەڵاتی كوردین.

ئـەوە یەکـەم جـار نییـە خـەڵکانێك بەرامبـەر بـە ڕەخنـە بووەسـتنەوە بـە نـاوی شارچییەتی دێنـە وەڵام، بۆئـەوەی گـەر نەیانتوانی لۆژیکێك بەکاربێنن بۆ دەیـالۆگ، ئەوا وەڵامەکـەیان وەك داکـۆکی بـۆ شـار ناوبـەرن، دیـارە لـەو نێوەندەشـدا وتارگـەلێکی زۆر کۆمیـدی نوسـران، هـەموو ئەوانـەش گوزارشـتیان لـە نـەبوونی بەرپرسـیاریەتی ئـەخلاقی نووسـین دەکرد، چونکە دیمانەکەی (سیوەیلی) بە دوور و نزیکەوە هیچ جنێو و قسەیەکی تیا نییە بە هەولێر، وەك هەندێك گوایە بەو باسە قەڵسن، دیارە گەر مەسەلەکە وا لێکدرابێتەوە گوایە بۆیە هاتونەتە وەڵام، چونکە ووتراوە "هەولێریی هەتیوبازن" کەوا نەووتراوە، بەڵام خۆ واش وترابێت ئەوە تەنها گوزارشتی لەو دیاردەیە کردووە، کە نەك هەر لە هەولێر و کوردستان، بەڵکو ئـەو دیاردەیـە لـە مێـژووی عێراقـدا ڕەگێکـی قـووڵی هەیـە، مێژووەکەشـی بـۆ سـوپای ئینکـشاری دەگەڕێتـەوە، دواتـر لـە فـۆڕمی جەندرمـە لای عوسمانییـەکان تـەواو گەشـەی کـرد، تاڕادەی ئەوەی هەر شوێنێك جەندرمەی لێ بووبێت و لانکەی گەشـەکردنیان بووبێـت، ئـەوا ئـەو دیاردەیـە زیـاتر لای ئـەوان بـوونی هـەبووە، جەندرمـە لـە کۆمـەڵگای عێراقـی و کوردیـدا کارەکتەرێکـە هـەڵگری ناسـنامەی (حیـزە)، هـەر بۆیـە ئەگـەر شـارێکی وەك پـردێ لـە ڕابـردوودا شـوێنێکی دیـاری بـوونی جەندرمـە بووبێـت، ئـەوا بـە هـۆی جەندرمـەوە دەسـتەواژەی

(حیزی پردیَ) لە کۆمەڵگای کوردیدا سەپاوە، لە ڕاستیدا ئەوە ئاماژەیە بۆ جەندرمە لەو شوێنەدا دواتر لە هەر شوێنێك پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەی سرووشتی خۆی تێنەپەڕی بێت، ئەوا زەمینەی لادانی سێکسی و هەتیوبازی سەریهەڵداوە، گەر بە زمانی (عەلی وەردی) قسە بکەین دەڵێین "لە هەر شوێنێك حیجاب زۆر بوو مانای وایە هەتیووبازی سەرهەڵدەدات"، نووسەران سەر بەهەر ڕەنگ و ئایدیۆلۆژیایەك بن، دواجار مافی خۆیانە گفتوگۆ بکەن لەو ڕێگەیەوەی کە بڕوایان پێیەتی، هەموو ئەو دەمامکە ئایدیۆلۆژییە ساختانەش زوو کۆتایی دێت، بەلاَم ئەوەی لە هەمووی سەیرترە ئەنجومەنی پارێزگای هەولێرە، ئەو ئەنجومەنە ساکارترین وەزیفەی خۆی بیردەچێت و خۆی دەخاتە ناو"پرۆسەی لە بیرکردن" بۆ ئەوەی مەحکومی نەکەین بە کەموکوڕییەکانی لە خزمەتی شارەکەدا، لە تەواونەکردنی پرۆژە خزمەتگوزارییەکان و نەبوونی توانای چارەسەرکردنی کێشەی ئاو و کارەبا و قیرتاو نەکردنی شەقامەکان و زبڵدانی گەڕەکە میللییەکان، کەچی دێت خۆی لە مەسەلەی نووسین هەڵدەقورتێنێت، خۆی لێدەبێت بە (ئەنجومەنی نووسینی هەولێر)، دێت لە ڕێگەی وشەی بریقەدارەوە ستایشی هەولێر دەکات، لە کاتێکدا کاری ئەو وشەی حەماسی نییە بۆ ئەو شارە، لە بری ئەو قسانە واچاکترە بچێت ئاو بۆ گەڕەکێك بێنێت، ئۆتۆمۆبیلی خۆڵ بێنێت بۆ

گەڕەکەکان، نەوەکو ببێت بە زمانحاڵی نووسەران، ئەو ڕەفتارەی ئەنجومەن دیمەنێکی زنجیرە تەلەڤزیۆنی (ژاڵە)ی بیرهێنایـنەوە، کـاتێ منداڵـە شـارییەکە دەچێتە سەرپـشتی گوێدرێـژی کـابرای لادێـی (فـەرەج)، کـە لادێـی فریـا دەکـەوێت هـاواری لێـدەکات و دەڵـێ "دابـەزە سـەر ڕووت دابـەزە"، کـە دیـارە سـەر ڕووت لای لادێی ئامـاژەیە بۆ کەسی شاری، بەڵام لە بەرامبەر ئەو جنێوانە زۆرن ئەوانەی پێویستیان بەوەیە پێیـان بووترێت "دابەزە سەر ڕووت دابـەزە"، ئـەوەی پێویـستی بـە ئامـاژەکردن بێـت، ئـەوە یەکەم جار نییە تەلەڤزیۆنی کوردی وێنەی ترس لە ناو کۆمـەڵگا دروست دەکات، بـەوەی مردنـی خـۆی بگوازێتـەوە بـۆ کۆمـەڵگا، بـەو شـێوەیەش دەیـەوێ گوتـاری بـەزەیی بـۆ حـزب و ڕق لێبوونـەوە لـە دوژمنـەکانی پیـادە بکـەین، وەك پێـشتر لـە نیـشاندانی وێنـەی قەسـابخانەکەی (خێڵـی حەمـە)دا لـەلایان کەناڵی کوردسـاتەوە بینیمـان. دیـارە ئەوکاتـەی ئـەو دامـەزراوە دەیەوێ ڕقمان لە ناو دروست بکات و بەرەو توندوتیژی هانمان بـدات، بۆخـۆی دڵنیـابوونی ئـەو دامەزراوەیـە لـە سـتراتیژی پرۆسـەی بینینـی ئێمـەی بینـەر، چـونکە وەك بۆدریـار دەڵێـت "بینەری تەلەڤزیۆن مرۆڤێکی مۆنۆپۆلکراوە". ئەگەر یادەوەریی سیاسی حزبەکان یادەوەریەك بێت بۆ ناشیرینکردنی ئەویتر، بە کەسی بەعسی ناوی بەرامبەرەکانی بردبێت، ئەوا ئەو دامـەزراوە بە دوای کۆڕەو توانی مرۆڤەکانی ئەو کۆمەڵگایە کۆنترۆڵ بکات،

تـا ئاسـتی ئـەوەی لـە یـەکتر ماچـکردنی (تاڵـەبانی) و (سـەدام حوسـێن) وەك کـارێکی ئاسـایی تەماشـا کرایـەوە، ئـەوە ئـەو دامـەزراوە بـوو ئـەو ماچـکردنەی لـەلایان زۆربـەی کۆمـەڵگا، بـە تایبـەت لای یەکێتیـەکان کـرد بـە کـارێکی ئاسـایی، نـەك هـەر هێنـدەش، ئـەو دامـەزراوە توانـای ئـەوەی هـەبوو مومارەسـەی دەسەڵاتێك بکات کە لە توانای دەزگا سـەربازییەکان نـەبوو، ئەو ترسـە بـەو قەبارەیـە مومارەسـە بکـەن، وەك لـە ڕووداوی (31)ی ئابدا بینیمـان، کـە ئـەوە ڕێکخـراو و ناوچـەکانی پـارتی نـەبوون، خەڵکی ناپارتیان بە تایبەت یەکێتییەکانیان لە هەولێر دەمکوت کرد، بەڵکو ئەوە دیمەنەکانی تەلەڤزیۆن بوو، کاتێ وێنـەی هێـزە سـەربازی و پـەلامار و شکـستی کـوردی بـە دەسـتی کـوردی نیشان دەدا، ئەوە گەر بە زمانی (بۆردیۆ) تەماشـای بکـەین، ئەو وێنەیە بۆ تەلـەڤزیۆن بەرهـەمهێنانی دەسـەڵاتی فاشـیزم بـوو، بـە مانای ئـەوەی ئـەو ڕووداوە مومارەسـەی دوو دەسەڵاتی تیـاکرا، یــەکێکیان لــە ڕێگــەی دامــەزراوە ســەربازیەکانی بــەعس و پارتییەوە بوو، دەسەڵاتی دووەمیش دەسەڵاتێکی ڕەمزی بـوو، کە (بۆردیـۆ) فێـری کـردین بـە (فاشـیزمی ڕەمـزی) نـاوی بـەرین، ئـەویش تەلـەڤزیۆن بـوو، دیـارە لای (بۆردیـۆ) فاشـیزمی ڕەمـزی کاریگەرییــەکانی زۆر قــووڵترە، بۆیــە دەســەڵاتی کــوردی دەسـبەرداری نابێـت، وەك لـە کـاتی نووسـینی ئـەو وتـارەدا بینیمـان بـە بڕیـارێکی وەزارەتـی نـاوخۆ (هـەولێر) کـەناڵی

ئاسمانی کوردستان بۆ ماوەی (24) کاتژمێر ڕادەگیرێت بە بیانووی ئەوەی شەوی پێشتر کۆڕێکی نووسەرێکی پەخش کردووە و سوکایەتی بە ئیسلام کردووە، دواتر پەیامنێری ئەو کەناڵە دەست خۆشی لە کۆڕگێر کردووە، وەزارەتی ناوخۆش وەك سزایەك بۆ ئەو کەناڵە ئەو بڕیارەی داوە.

ئەگەرچی وەزارەتی ناوبراو مافی ئەوەی نییە کەناڵێکی ئاسمانی ڕابگرێت "وەك چۆن ئەنجومەنی پارێزگاش مافی نییە ببێت بە ڕەقیب بەسەر نووسین و فیکرەوە" دەکرێت ئەوکارانە تاڕادەیەك، گەرچی ئەویش شیاو نییە کاری وەزارەتی ڕۆشنبیری بێت، بەلاّم لەبەرئەوەی لە کۆمەڵگایەکداین ئەنجومەنی پارێزگا قسە لە کولتوور دەکات، کەوابێت زۆر شیاوە وەزارەتی ناوخۆش چاودێر بێت بەسەر تەلەفزیۆنەوە، چونکە ئەوە ئەوانن شایستەترین کەسەکانی ناو ئەو کۆمەڵگایە، نەوەکو ڕووناکبیر و مامۆستایانی زانکۆ.

پێمان خۆش بێت یا ناخۆش وەزارەتی ناوخۆ لە کۆمەڵگای ئێمەدا بەرپرسیاری یەکەمە لە ڕووداوی توندوتیژی، هەر لە ڕەفتاری کارمەندەکانی لە ناو شەقام وبازگەکان، تادەگات بە تەقینەوەکانی بەردەمی خۆی، گەر ئەو وەزارەتە بڕیار واشە لەمەولا چاودێر بێت بەسەر تەلەفزیۆن، با پرسیارێکی بەرپرسیاریانەی لێبکەین، بۆچی ئەو هەموو وێنە توند و تیژیەی (شێخ زانا) لە تەلەفزیۆن نیشاندرا و کەناڵەکە

نەك هەر سزا نەدرا، بەڵكو وەك كارێكی پیرۆزی ڕاگەیاندن تەماشا كرا، لە كاتێكدا دەیالۆگ و ڕەخنە سزای لەسەرە، دیارە ئێمە لەگەڵ ئەوەدا نین لەسەر پرۆگرامی تەلەفزیۆن و وتاری ڕۆژنامە پارێزگا و هێزەكانی ناوخۆ دەست بخەنە كاروباری میدیاكانەوە، وەزارەتی ناوخۆ با سنوورێك بۆ ئەو تەقینەوانە دابنێت كە ڕۆژانە بە بەردەمی بارەگاكەی خۆی دەتەقێتەوە، نەوەك سزای كەناڵێكی ئاسمانی بدات، ئەو لەوە تێناگات ئەو كەناڵە ڕەنگ و دەنگی كوردە، ئاخر بیانییەك ناڵێت ئەوە تەلەفزیۆنی پارتییە، ئەوە بە كەناڵی ئاسمانی كوردی سەیر دەكرێت، ئەگەرچی حزب تەواو مۆنۆپۆلیشی كرد بێت، بەلاّم بۆ ئەوەی خۆمان لە گلەییكردن لەو دامەزراوانە نوقم نەكەین، پێویستە ئەو نهێنییە سادەیەی لەو ڕەفتارە بۆمان كەشف دەبێت ئاماژەی بۆ بكەین، ئەویش پەیوەندی هاوبەشی هەریەك لە دەزگاكانی ئاسایش و تەلەفزیۆنە، كە دیارە لە ناو ئەو پەیوەندیە هەندێ سوعبەتی برایانە هەیە، وەك لەو داخستنەی (ktv) دا بینیمان، ئەو سوعبەتكردنە هەر بە تەنیا بۆ قسەكردن نییە لە دەسەلاّت فراوانی وەزارەتی ناوخۆ، بەڵكو هەوڵێكیشە بۆ داخستنی تەلەفزیۆنەكانیتر، بەوەی داخستن لە كەناڵە ئاسمانییەكەی پارتییەوە دەستی پێكرد، ئەگەر ئەوكارەش دەرفەتێكیتر بكاتەوە بۆ ڕاگرتن و وەستانی تەلەفزیۆنی ئیسلامییەكان، ئەوا زەمینەی ئەو كارە بە تەنیا هێزەكانی

ئاسـایش و وەزارەت نـین کـە پێـی هەڵدەسـتن، بـەڵکو خـودی تەلەڤزیۆن خۆیەتی، کە بەو ئاراستەیە براوە، بۆیە ئەوە بە تـەنیا (شێخ زانا) و گرووپەکەی نەبوون مرۆڤیان ئەتك کرد و سەریان بڕین، نا بەڵکو ئەوە ئەو دامەزراوەش بوو کە بە ویستی خۆی ئەوەی پێی خۆش بوو نیشانیدایین، بۆیـە (شـێخ زانـا) چەندە کارەکتەرێکی بکوژی نێو کۆمەڵگای کوردییە، سەد هێندەی ئەو ئـەوە تەلەڤزیۆنـە گوناهبـار و بکـوژی ئـەو تاوانـە. ئـەوە تەلەڤزیۆنی کوردی بوو جارێکیتر ڕووە توندوتیژییەکەی خۆی نمایش کرد، لـەو ڕێگەیـەوەش مۆنۆپـۆلی بینـەری کـرد، بـەوەی پیاوانی ئاسایش فریادڕەسی ژیانمانن، هەموو ئیسلامییەکان (شـێخ زانـا)ن و دەبێـت ڕقمـان لـە بەرامبـەریان گـەورە بێـت، تـا دواجار کار گەیشتە ئەوەی مامۆستایەکی زانکۆش بکەوێتە بەر هـەمان هەڕەشـە، بۆیـە (شـێخ زانـا) جگـە لـە کارەکتـەرێکیتری تەلـەڤزیۆنی کوردی شتێکیتر نییە کـە زەمینـەی توندوتیـژی لـە ناو کۆمەڵگا دروست دەکات.

کوشتن و لەسێدارەدانی ئەو گرووپە، کوشتن و لە
سێدارەدانی زانیارییە کە خەڵک مافی خۆیەتی
بیزانێت، ئاخۆ ئەو گرووپە چۆن دروست بوو؟ کێ
لە پشتی بوو؟ کێ یارمەتیدان؟ لە کاتی شەڕی
خۆکوژیدا چیان کردووە؟ چۆن گەشەیان کردووە؟
چۆن گەیشتوونەتە ئەو ئاستە بێئەوەی یەکێتی
و پارتی و دەزگا ئیستخباراتەکانیان پەی
پێببەن؟ لەو وڵاتەدا بچوکترین گرووپ دامەزرێت
کە بیانەوێت سەنتەرێک دابنێن، یاخود
ڕۆژنامەیەک دەرکەن، بە کەمترین کات ئەو دەزگا
جاسوسییانە پێی دەزانن، هەر زوو پەیوەندیان
پێوە دەکەن، تا بۆشیان بکرێت گەرای خۆیان لە
هەناوی دروست دەکەن، باشە مانای چییە لەو
واقیعەدا گرووپێکی لەمجۆرە مەترسیدار هەبێت
و ئەو دوو دەزگایەش ئاگایان لێنەبێت، لۆژیکی
نییە وا بیربکەینەوە کە پاراستن و زانیاری
ئاگاداری گرووپی شێخ زانا نەبووبن؟ ئەی
دەزگاکانی حکومەتی هەرێم، ئەوانەی بەرپرسن
لە ئاسایشی هاوڵاتیان لە کوێی ئەو ڕووداوەدان؟
خەڵک مافی خۆیەتی بزانێت ڕۆڵی ئەو دەزگا
بەرپرسانە لەو پرسەدا چییە؟ ئاخۆ کارەساتە لە
ماوەی چەند ساڵێکدا گرووپێکی تاوانکاری
ڕێکخراوی لەو چەشنە هەبێت و دەزگا
ئەمنییەکانی حکومەت پێی نەزانن.

2007



Design: akar jalal

Lebarey Şêx zanawe